

# موفتی زەهاوی

## (١٧٩٣ - ١٨٩٠ز)

نوسینی

**مامۆستا شێخ محەمەدی خاڵ**

(١٩٠٤ - ١٩٨٩ز)

ئامادەكردنی بۆ چاپ و زیادكردنی كۆمەڵێك بابەتی نوێ

**عەبدولحەمید مەلا محەمەدئەمین كانی میرانی**


له بڵاوكراوەكانی

سەنتەری زەهاوی بۆ لێكۆڵینەوەی فیكریی (٦٦)


موفتی زەهاوی

نوسینی: مامۆستا شێخ محەمەدی خاڵ

**ئەم كتێبە...**

یەكەمین هەوڵە بۆ ناساندنی زانا و پێشەوای گەورەی كورد (مەلا محەمەد فەیزی ئەفەندی) ناسراو بە (موفتی زەهاوی)، لە نوسینی مامۆستای ڕەوانبێژ مامۆستا شێخ محەمەدی خاڵ.

موفتی زەهاوی، پێشەوایەكی مەزن و زانایەكی بلیمەتی لێهاتوی بێوێنەی خاكی كوردستان بووە، چرایەكی پڕ شەوق و پرشنگداری سەردەمی خۆی بووە. تەمەنێكی درێژی هەبووە نزیک بە سەد (١٠٠) ساڵ ژیاوە. خودا دەرفەتی بۆ ڕەخساندووە كە سەرتاپای ئەم تەمەنەی بە فێربوون و وتنەوەی وانە شەرعیەكان و خزمەت كردن بە زانست و ئایین و ئەدەب بەڕێ بكات، نزیكی چوار هەزار زانا و خوێندەوار لەبەردەستیدا پێگەیشتوون و لەلای ئەو بەهرەمەند بوون. لەبەر بڵندی پێگەی زانستیی كراوە بە موفتی شاری بەغداد.

مامۆستای خاڵ هەرچییەكی دەست كەوتووە لە باسی ژیان و چیرۆک و بەسەرهات و شیعر و نوكتە و قسەی نەستەق و بە پێزی موفتی زەهاوی كۆی كردووەتەوە و لە دوتوێی ئەم كتێبەدا لە ساڵی (١٩٥٣) چاپی كردووە.

لە پاش تێپەڕینی نزیكەی (٦٥) ساڵ بەسەر چاپكردنی ئەم كتێبەدا ئامادەكار بە هاوكاریی سەنتەری زەهاوی لە چاپێكی نوێدا كاری لەسەر پێداچوونەوەی دەستنووسەكان و زیادكردنی هەندێ پەراوێز و ڕاستكردنەوەی هەندێک هەڵە كردووە.

نرخ: (٢٠٠٠ دینار)

# موفتی زەهاوی

(١٧٩٣-١٨٩٠ز)

نوسینی: مامۆستا شیخ محمدی خاڵ

(١٩٠٤ - ١٩٨٩ز)

ئامــادەکردنی بۆچاپ و زیادکــردنی کۆمەڵێك بـابـەتی نــوێ:

**عــەبدولحەمید مەلا محەمەدئەمین کانی میرانی**

مــامۆستا لە زانکۆی سلێمـانی/ کۆلێجی زانستە ئیسلامیەکان

# موفتی زەهاوی
(١٧٩٣-١٨٩٠)

لە بڵاوکراوەکانی سەنتەری زەهاوی
بۆ لێکۆڵینەوەی فیکریی ژمارە ( ٦٦ )

- نووسینی: مامۆستا شێخ محەمەدی خاڵ
- بابەت: مێژوویی
- دیزاین: ڕەوشت محەمەد.
- چاپ: یەکەم. ٢٠١٨. ناوەندی ڕینوێن.

لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان
ژمارە (١٤٩١)ی ساڵی ٢٠١٨ی پێدراوە.

سەنتەری زەهاوی بۆ لێکۆڵینەوەی فیکریی
www.zahawi.org
ناونیشان: شەقامی سالم
تەلاری جەمالی حاجی عەلی نزیک پردی خەسرەوخاڵ
07702422171

# ناوەڕۆك

# پێشەکی

بەناوی خودای باڵادەست

زۆر زانا و ڕوناکبیر و بیرمەند و کەسانی بەتوانا خزمەتیان بە ئایین و زانست و فێرکردن کردووە لە کوردستاندا، لە سەردەمی خۆیاندا ناوبانگێکی گەورەیان هەبووە، بەڵام –بەداخەوە– ئێستا بەشێکی کەمیان ناویان ماوەتەوە و زۆرینەیان بێ ناونیشانن. هەر لەناو ئەم زانایانەدا لە کوردستان زانایەکی بلیمەتی لێهاتووی بێوێنە سەری هەڵداوە، چرایەکی پڕ شەوق و پرشنگداری تر هاتۆتە کایەوە، ئەستێرەیەکی عیلم و زانستی دیکە لە ڕۆژگاری بابانیەکاندا درەوشاوەتەوە، زانایەك کە ژیانی پڕ بەرەکەتی خۆی بەخت کردووە لە ڕێگەی زانست و فێرکردندا، نزیکی هەشتا (٨٠) ساڵ خەریکی وانە وتنەوە و فتوادان بووە...ئەم زانایەش (مەلا محمد فەیزی ئەفەندی) ناسراو بە (موفتی زەهاویی)ە.

ئەم زانا گەورەیە یەکێکە لەو کەڵە پیاوانەی کە لەمرۆدا ناو و ناونیشانی کوێر بووەتەوە و وەکو پێویست ناسراو نیە. ئەم پێشەوا مەزنە تەمەنێکی درێژی هەبووە نزیك بە سەد (١٠٠) ساڵ و خوا دەرفەتی بۆ ڕەخساندووە کە سەرتاپای تەمەنی بە فێربوون وتنەوەی وانە شەرعیەکان و خزمەتکردن بە زانست و ئایین بەڕێ کردووە، نزیکی چوار هەزار (٤٠٠٠) زانا و خوێندەوار لەبەردەستیدا

پێگەیشتوون و لەلای ئەو بەهرەمەند بوون. پایەی بەرزی زانستیی (موفتی زەهاوی) وای لێکردووە کە کەسێکی نزیك بێت لە دەستەڵاتدارانی سەردەمی خۆی، چ ئەوکاتەی کە لە سلێمانی ژیاوە، جێگەی بایەخی بابانیەکان بووە و چ ئەو کاتەی کە چووەتە بەغداد پایەیەکی شیاو بە خۆی پێ دراوە و کراوەتە موفتی شاری بەغداد.

ئەم زانا پایە بڵندەی کورد، وەك زۆرێك لە زانایان و ناودارانی تری ئەم وڵاتە، خاکی کوردستان نەبووەتە لانەی حەسانەوەیان و جێگەی خزمەتکردنیان بە زانست و ئایین! بەڵکو هەرزوو باری پێچاوەتەوە و کۆچی کردووە بۆ بەغداد، کە یەکێك بووە لە شارە ناودارەکان، لەوێ بواری زیاتری هەبووە بۆ دەرخستنی توانا و لێهاتوویی خۆی و خەڵکێکی زیاتری دیوە و فەقێی زۆرتر هاتوونەتە لای و پایەیەکی بەرزتری پێدراوە.

ئەوەی جێگەی داخە، ئەم زانا گەورەیەی کورد وەك پێویست نەناسێنراوە، توێژینەوە و نوسینی زۆری لەسەر نەکراوە، ئەوەی کە هەیە شتێکی ئێجگار کەمە و لە پەنجەی دەستێك تێناپەڕێت.

یەکەمین کەسێك کە هەوڵی ناساندنی ئەم زانایەی داوە، مامۆستای ڕەوانبێژ و خاوەنی خامەی بەفەڕ مامۆستا شێخ محەمەدی خاڵە، کە بە نوسینی ئەم کتێبە هەوڵی داوە پەردەی تاریکیی لەسەر ژیانی (موفتی زەهاوی) لا ببات.

مامۆستای خاڵ لەم کتێبەدا هەرچیەکی دەستکەوتووە لە باسی ژیان و چیرۆك و بەسەرهات و شیعر و نوکتە و قسەی نەستەق و بەپێزی موفتی زەهاوی کۆی کردوونەتەوە و لە دووتوێی ئەم کتێبەدا لە ساڵی (١٩٥٣)ز دا چاپی کردووە.

لە ڕاستیدا ئەم کارەی مامۆستای خاڵ شیاوی ئەوەیە زۆر بەرز بنرخێندرێت و بایەخی تایبەتی پێ بدرێت، بەوەی کۆمەڵێك زانیاری و شیعر و سەرگوزەشتەی موفتی کۆکردونەتەوە و پاراستونی لەم کتێبەدا، کە ئەگەر بەو نەبوایە زەحمەتە بە کەسێکی تر بکرایە و ئەگەر ئەو کارەی نەکردایە لە کاتی خۆیدا، زۆرینەی ئەو زانیاریانە لەسەر موفتی لەناودەچوون.

لە پاش تێپەڕینی نزیکەی (٦٥) ساڵ بەسەر چاپکردنی ئەم کتێبەدا، بە پێویستمزانی کە جارێکی دیکە بخرێتەوە بەر دیدەی خوێنەوارانی کوردزبان و نەوەی ئەم سەردەمە ئاشنا بکرێت بە ژیان و بەرهەمی (موفتی زەهاوی).

**کاری من لەم کتێبەدا:**

١ـ نوسینەوەی تەواوی کتێبەکە وەك خۆی، لە ڕێگەی چاپی پێشووەوە.

٢ـ پاشان بەراوردکردنی بە نوسخەی دەستنوسی مامۆستا شێخ محەمەدی خاڵ و دەستنوسێکی تر کە لە ڕووی نوسخەی یەکەمدا نوسراوەتەوە.

٣ـ ڕاستکردنەوەی هەڵەکانی چاپی پێشوو.

٤ـ زیادکردنی چەند بابەتێك لە ڕێگەی نوسخە دەستنوسەکەوە، کە لە چاپی پێشوودا نەنوسراون.

٥ـ گۆڕینی بەشێك لە وشەکان بۆ ڕێنووسی کوردی نوێ.

٦ـ زیادکردنی کۆمەڵێك پەراوێز، کە لە کۆتایی پەراوێزەکانەوە نوسیومە (ئامادەکار)، بۆ جیاکردنەوەی لە پەراوێزەکانی مامۆستای خاڵ.

٧ـ ئەو پەراوێزانەی زیادمکردووە بریتین لە:

أـ چەند زانیاری و بابەتێکی نوێ.

ب ـ هەندێك تێبینی لەسەر چەند زانیارییەكی ناو كتێبەكە.

ج ـ ئاماژەكردن بۆ چەند سەرچاوەیەك بۆ پشتڕاستكردنەوەی كۆمەڵێك بابەتی ناو ئەم كتێبە.

ح ـ ماناكردنی چەند وشەیەكی كۆن كە لەمڕۆدا ئەو وشانە بەكار نایەن.

٨ـ زیادكردنی پاشكۆیەك لە كۆتاییەوە، كە بریتییە لە سێ (٣) قەصیدەی فارسی موفتی، كە مامۆستای خاڵ ئاماژەی پێ كردووە هەوڵی داوە و بەدەستی نەگەیشتووە، سوپاس بۆ خودا من توانیومە بە دەستی بێنم و لەو پاشكۆیەدا بینوسمەوە بە مانا و لێكدانەوەوە.

لێرەدا بە پێویستی دەزانم سوپاسی هەموو ئەو كەس و لایەنانە بكەم كە هاوكارم بوون بۆ ئامادەكردن و بە چاپگەیاندنی ئەم كتێبە بەنرخە لەم شێوەیەی ئێستادا.

كۆتایی قسەیشم:

ئەم بەرهەم و ماندووبونە پێشكەش بێت بە گیانی پاكی:

مەلا محمد فەیزی ئەفەندی زەهاوی و شێخ محەمەدی خاڵ...

هیواخوازم بەم كارە ڕۆحیان شاد ببێت و دەروونیان ئاسودە ببێت...

عبدالحمید مەلا محمدئەمین كانی میرانی
مامۆستا لە زانكۆی سلێمانی/ كۆلێجی زانستە ئیسلامییەكان
٢٠١٨/٦/١١
Hajihamid23@gmail.com

# به باڵابڕین
# عەبدولرحمن بەگی بابان

بۆ زانا و دانای گەورەی کورد: جەنابی شێخ محەمەدی خاڵ...

کردەوەی ژیان (تەرجەمەی ئەحواڵ)ی عەللامەی بەناوبانگی کورد خوا لێبووردو (موفتی زەهاوی)م بە چاوی ناز و نیاز خوێندەوە. بەندە هێزی زانستیم ئەوەندە نیە کە بتوانم ستایشی زانایەکی وەها گەورە و بەناوبانگ بکەم، بەڵام زۆر بە گەرمی سوپاسی ئێوە دەکەم کە لە بیری قوڵی لە بیرچونەوە و فەرامۆشیدا، بەتێچون و ڕۆچونێکی زۆر، توانیتان لەم گەوهەری عیلم و مەعریفەتە چەند پارچەیەکی زیادار و ڕووناك دەرهێننە دەرەوە و بیخەنە مەیدانی تەماشاگاهی دانایانی زەمانەوە، بەندە هەرچەند باوەڕم بە نەزانی خۆم هەیە، بەڵام بەم چەند شیعرەی لای خوارەوە هیوادارم کە تۆزێك بەشداریی ئەم خزمەتە ببم.

**نــــاتیقەم کوڵ و کولە مەدحی زەهــــاوی ناکەم**<br>
**بــاســـی عیلم و ئەدەبی بــەرز و بڵاوی ناکـــــەم**<br>
**ڕۆژ کە مەعلومە ئەمن مەدحی هەتاوی ناکـــــەم**<br>
**چونکە تا شۆری حەشر خەتم و تـــەواوی ناکەم**<br>
**هەرچی فەرموتە کەمە، واجبـــە لام شــــوکرانی**<br>
**چونکە بوژێنەوەی ئەم شۆرەتە هــەر تۆی بانـی**

**فیـکری تیژی بە مەسەل هەروەکـو ڕاداریێ بوو**<br>
**یەك نەزەر کاشیفی هەر موشکیل و ئەسراریێ بوو**<br>
**سینــەیی پاکـــی کتێبخانەیی ســـەیاریێ بـــوو**<br>
**لــە خەزێنەیی ئەدەبا گەوهەری شەهواریێ بــوو**

شـــۆرەتی هەروەکو ڕۆژە بە کســوف گیرابوو
وات ڕەهــا کرد لە پڕا نور و زیا پــــەیدا بوو

عالمێکی وەکو موفتی کە لە پاش عەسری ساڵ
کەس نەبوو فەزڵ و دهای بەرزی بهێنێتە خەیاڵ
بەمــە هێناتەوە سەر تەختی زەمـــانی ئیقباڵ
بارك الله لـك ئــــەی زوبــدەیی ئەحـفادی خاڵ
غــیرەتـی قەومیــەتیت لایقی ئیسـتیحســـانە
خوشـــــەویستی وەتەنت حوببی (مــن الإیمان)ە

شێخ ئــەبو بەکری موسەننیف کە بــــە تۆ باپیرە
لــە هــەمـوو کردەوەتا پشت و پەنا و دەسگیرە
خزمەتت لای هەمــوو کەس جێی نەزەر و تەدبیرە
عـــائیلەی ئێـوە هەمــوو مەزهەری لـــوتفی پیرە
غیرەتـی قـەومیەتیت بەم ئەســـــەرە گەییە فەلەك
قەومی کورد شوکرت دەکەن تیرە بە تیرە و لەك لەك

عبدالرحمن بابان
٢٧/کانونی دووەم/١٩٥٣

## پێشەکەشکردنی ئەم نوسراوە

پێشکەش بێت بە گیانی پاکی ئەو زانا و دانا کوردانەی کە ماوەیەك وەك چرا هەڵگیرساون و ناوچەیەکیان ڕووناك کردووەتەوە، لە پاشیشا بەبێ ناونیشان سەریان ناوەتەوە.

بۆ گیانی ڕەوانی ئەو خاوەن بیرانەی کە بە بیری بەرز و قەڵەمی ڕەوانیان کەلەپوورێکی خوێندەوارانەی بەنرخیان بۆ بەجێهێشتووین و خۆشیان بەبێ مێژووی ژیانیان ون بوون و کراون بە ژێر خاکەوە.

بۆ گیانی هەموو خوێندەوارێکی کوردەواریی کە دەستی قەڵەمی گرتبێ و شتێکی جوانی نوسیبێ.

(محەمەدی خاڵ)

## بەناوی یەزدانی پاك

## سەرەتا

پیاوی گەورەی هەڵکەوتوو وەك مانگ و ڕۆژ، یان ئەستێرەی کۆ و گەلاوێژ وان بە ئاسمانی مێژووەوە، هەروەك ئەمان بە درێژایی شەو و ڕۆژ و ساڵ و مانگ، تا بە ئاسمانەوە دیار و لە وورشە و پرشەدابن، هەموو کەسێك بەهرەیان لێ وەردەگرێت، هەزاران سەرلێشێواو ڕێگایان پێ ئەدۆزنەوە و لە تەنگانە خۆیانی پێ ڕزگار دەکەن. پیاوانی زانای دانای ژیری خاوەن بیری بەرزی هەڵکەوتووش وان، تا بە ئاسمانی مێژووەوە بریسکە و تریسکەیان بێت و ژینی ڕەنگاو ڕەنگیان بەسەر ڕووپەڕەی کاغەزەوە بنوسرێت، هەموو خوێندەوارێکی خاوەن بیر لە هەموو گوفتار و کردارێکیان پەندێك و لە هەموو ڕەوشت و خوویەکیان بەهرەیەك وەردەگرێت، دەبن بە سەرمەشقی باشیی و چاکیی بۆ پاش خۆیان.

بەڵام ئەگەر ناوی پیرۆز و فەرخوندەیان لەسەر ڕووپەڕەی مێژوو نەنووسرا، بە ئاسمانی مێژووەوە نەبریسکانەوە، ئەو کاتە وەك ئەو ئەستێرانە دەبن کە لەیەك کاتدا و لەیەك دەمدا دەکشێن و تروسکەیەك دەدەنەوە و لە پاش هەناسەیەك دەچنەوە پەردەی نەبوون، ئەڵێی هەر نەهاتۆتە جیهانەوە.

لە خاکی پاکی کوردستاندا دەتوانم بڵێم بەقەد ئەستێرەی ئاسمان پیاوی دانا و بزان و شاعیر و پێشەوای تێدا هەڵکەوتووە، بەڵام — داخی بەجەرگم— لە هەزاردا نۆسەد و نەوەد و نۆیان وەك ئەستێرەی بێ ناوونیشان لە تاریکی نیوەشەودا ئاوابوون و ون بوون، تا ئێستا یەکێك نەبووە کە ژینێکی ئەم پێشەوایانە بنوسێت،

بەڵێ بووە، بەڵام هەر ژینی بێگانەیان نووسیوە، وەك لەلایان گوناه بووبێت کە ناوی زانایەکی خۆیان بنووسن.

باپیرەی گەورەی خۆم (مەلا ئەبوبەکری موسەنیف) خاوەنی (وزوحی شەرحی موحەڕڕەڕ) کە چوارسەد (٤٠٠) ساڵ لەمەوپێش بووە، مێژوی زانایانی شافیعیی نوسیووە، لەو مێژووەشدا ژینی (ئیبنو حەجەر) کە لە (مەککە) بووە و لە تەمەن و زانینا وەك خۆی وابووە، نوسیویەتی، بەڵام ناوی مامۆستاکانی خۆی کە ئەو عیلمە بێ پایانەی لێ وەرگرتوون نەنووسیوە.

زۆر دوور نەڕۆین ئەوە (موفتی زەهاویی) کە شەست و چوار (٦٤) ساڵ لەمەوپێش کۆچی دوایی کردووە[١]، کەچی تا ئێستا یەکێك ژینی نەنوسیوە و شیعرەکانی کۆنەکردووەتەوە، جا توخوا نەنگ و بەدناویی نیە؟ شێرێکی شێرخۆری وەك (موفتی زەهاوی) کە سەد (١٠٠) ساڵ ژیابێت، هەشتا (٨٠) ساڵ لەسەر یەك تەدریسی کردبێت و هەزاران زانا و بزان و پێشەوای پێگەیاندبێت، سی و هەشت (٣٨) ساڵیش لەسەر یەك موفتی ویلایەتی بەغداد بووبێت، لەگەڵ تەدریسا فتواشی دابێت و لە زمانی کوردی و فارسی و تورکی و عەرەبیدا ئەدیب بووبێت، کەچی ئەمڕۆ ژیینی لە هیچ کەسێکەوە دیار نەبێت، شیعرێکیشی لەسەر ڕووپەڕەی کاغەز نەنووسرابێت!!!

خوا ئەیزانێ موفتی زەهاوی لە ئێمە نەبوایە لە هەر گەلێکی تر بوایە، تا ئێستا لە سەد لاوە ژیانی ئەنوسرا و هەموو ساڵێك لەو ڕۆژەدا کە تیایا مردووە یادێك دەکرا، لە گۆڤار و ڕۆژنامە و ئێستگەکاندا ناوی زیندوو دەکرایەوە.

هیوادارم بە خوا لەمەولا ئەم نەخۆشییە لە مێشکمان دەربچێت، ناوی هیچ عالم و شاعیرێکمان لە ژێر چنگ دەرنەچێت، بە دڵێکی پاکی چاکی ڕووناکی خاوێنەوە تەماشای هەموو کەسێك بکەین و هونەرێکی ئەگەر ببێت بی نوسین و ونی نەکەین.

---

(١) مامۆستای خاڵ لە ساڵی (١٩٥٣) ئەم کتێبەی نوسیووە، کە دەکاتە (٦٤) ساڵ پاش کۆچی دوایی موفتی زەهاوی. (ئامادەکار)

# ئەم ژیانی موفتییەم چۆن نووسی؟

منالّ بووم هێندێ جار داستان و بەسەرهاتی موفتی زەهاویم لە شێخی باپیرم[1] دەبیست، کە لە خۆی یان لەوانەی بیستبوو کە هاودەمی موفتی بوون، جا لەمانە هێندێکم لەبیر مابوو، بەرەبەرە نوسیمن تا وای لێهات مرخم لێخۆش کرد کە بیکەم بە کتێبێك، ئینجا دەستم کرد بە جوستوجوکردن[2] لە هەموو لایەکەوە، تا ئەم نوسراوەم پێکەوەنا. هیچ خوێندەوارێك نەما گومانم بردبێ کە شیعری موفتی لەلایە و پرسیارم لێ نەکردبێت، یان کاغەزم بۆ نەنوسیبێت، زۆر جاری وابووە لە وەڵامی دە (١٠) کاغەزدا تاقە شیعرێکم دەستکەوتووە، هەروەك گەلێك کتێبم لە کتێبخانەکانی کوردستان پشکنیوە و زۆر کەشکۆڵی دەستنوسم خوێندووەتەوە، یا هیچم دەستنەکەوتووە، یا شیعرێك دوانم دەستکەوتووە.

تکا ئەکەم لە خوێنەوارانی ئەم کتێبە ئەگەر شتێکی وا شك دەبەن کە نەنوسرابێت بۆم بنێرن، تا لە چاپی دووەما لێی زیاد، گیانی موفتی پێ خۆشنوود[3] و چاوی خوێندەوارانی پێ ڕوون بکەینەوە.

**محەمەدی خالّ**

---

(١) مەبەستی لە حاجی شێخ ئەمینی خاڵە، کە باپیرەی مامۆستا شێخ محەمەدی خاڵە و زانایەك و خواناسێکی گەورە و بەناوبانگ بووە لە شاری سلێمانی دا. لە ساڵی (١٨٣٤ز) لەدایك بووە و لە ساڵی (١٩٣١ز) کۆچی دوایی کردووە. (ئامادەکار)

(٢) جوستوجو: وشەیەکی فارسییە، واتە: بەدواداگەڕان. (ئامادەکار)

(٣) خۆشنوود: وشەیەکی فارسییە، واتە: شادومان، خۆشحالّ. (ئامادەکار)

# موفتی زەهاوی

موفتی ناوی (محەمەد)، تەخەلوصی (فەیزی)یە، بەپێی نوسینی خۆی لە پشتی کتێبێکی: کوڕی (مەلا ئەحمەد)ی کوڕی (حەسەن بەگ)ی کوڕی (ڕۆستەم بەگ)ی کوڕی (کەیخوسرەو بەگ)ی کوڕی (ئەمیر بابا سلێمان)ە.

ئەم (ئەمیر بابا سلێمان)ە وەك (ئەمین زەکی بەگ) لە (مشاهیر الکرد)دا[1] نوسیویەتی: کوڕی (فەقێ ئەحمەدی دارشمانە)یە، بەم پێیەش موفتی لە خانەوادەی بابانە. بەپێی نوسینی (ئەمین زەکی بەگ) لە (تاریخی سلێمانی وە وڵاتی)دا[2]: موفتی لە ساڵی (١٢٠٨ك) لە شاری سلێمانی لەدایکبووە و لە ساڵی (١٣٠٨ك–١٨٩٠ز) لە شاری بەغداد کۆچی دوایی کردووە، لە مەدرەسەکەی خۆی کە پێی دەڵێن (مەدرەسەی سلێمانی) نێژراوە.[3]

---

(١) محمد أمین زکی، مشاهیر الکرد وکردستان. (ب١/ل١٢٩). (ئامادەکار)

(٢) محمد أمین زکی، تاریخی سلێمانی وە وڵاتی. (ل١٨٢). (ئامادەکار)

(٣) بەم بۆنەیەوە (سید أحمدی راوی واعیظ) کە مەشهورە بە (أبو حلق الذهب) ئەم چەند شیعرە عەرەبییەی وتووە لە شین و تەئریخی کۆچیدا:

**دفنوك یا کهف الوری تحت الثری**
**ویلي عــلیك وویــل کــل مــوحد**
**مــاضمت الغبراء مــثلــك ثاویــا**
**لا والذي هـــو عالـــم مــــا في غد**
**أبكیت كتب الدین دمعا بل دمـــا**
**وبكتك كتب الســـعد بل والســید**
**نصبوا علیــك مــــآتما ولو أنهــم**
**رامـــوا نفاد حدادهـــم لـــم ینفد**

بەپێی سیجللی حکومەتی عوسمانی، موفتی لە ساڵی (١٢١٨ك) لەدایکبووە، بەڵام ئەمین زەکی بەگ لە کتێبی ناوبراویدا دەڵێت: ئەمە وانیە.[1]

لامواییە ئەمین زەکی بەگ بۆیە وایوتووە چونکە ئەگەر وابێت دەبێت موفتی لە ساڵی (١٢٣٦ك) کە ساڵی مردنی (شێخ قەسیم)ی مامۆستایەتی عومری (١٨) ساڵانە بووبێت، لەگەڵ ئەمەشدا کە لەپێش مردنی شێخ قەسیمدا بەچەند ساڵێك موفتی فەقێ بووە لەلای، عیلمە بەرزەکانی لەلا تەواو کردووە، تەنها ریاضیات نەبێت، وەك

---

**أســفي عـــلى علامة الدنيا الذي**

**كانت بـه كـل العـــوالـــم تهتدي**

**إذ لا ترى ذا العصر فضلا في امرئ**

**إلا ومــــــنه صدوره في الـــمورد**

**وعـــلى الحقيقة قـــد أتى تأريخه**

**(للدين ثلما عاد موت محمد)**

**١٣٠٨هـ**

هەر بەم بۆنەیەوە (عیرفان ئەفەندی)ش لە سلێمانی ئەم پێنج شیعرەی وتووە:

**ســــألت من الأيام يوما جمــاعة**

**وهم ساكبون الدمع بل ساكبوا الدم**

**فقلت لهم ماذا جـــرى من مصائب**

**فـــمن ذا الذي يبكيكمو بالتألـــم**

**فقالوا أمـــا أخبرت يا غافل الدنى**

**وفـــاة الزهاوي الشـــــهير بأعلم**

**جميع رجال المســـــلمين بأسرهم**

**أمــــا كان موت العالم موت عالم**

**ســـألت عجوز الدهر تأريخ موته**

**فـــقالت وتبكي (غـاب نجم المعالم)**

**١٣٠٨هـ**

(١) بڕوانە: محمد أمین زکی، تاریخی سلێمانی وە وڵاتی. (ل ١٨٢). (ئامادەکار)

لەمەولا دەردەکەوێت، ئەمەشی بەدوور زانیوە، بەڵام من بەشبەحاڵی خۆم ئەمە بە دوور نازانم بۆ هەڵکەوتوویەکی وەك موفتی.[1]

موفتی دایکی زەهاوی و خۆی لە سلێمانی بووە، بەڵام بەهۆی زوویربوونی مەلا ئەحمەدی باوکی لە حاکمی بابان، چەند ساڵێك سلێمانییان بەجێهێشتووە و بە خاوخێزانەوە چوون بۆ زەهاو[2] بۆ لای خاڵوانی موفتی، بەم بۆنەیەوە موفتی ئەم ناوەی وەرگرتووە، لە پاش هاتنەوەی لە زەهاو پێی وتراوە (زەهاوی).

تەنانەت دەگێڕنەوە دەڵێن: کاتێك کە (ناصر الدين شا) چووە بۆ بەغداد لە باخی (مەجیدی) — کە ئێستا پێی دەڵێن خەستەخانەی مەجیدی–[3] جێگای بۆ چاك کراوە، موفتی کە دەچێت بۆ لای شا، مەدحەت پاشا پێشکەشی دەکات و دەڵێت: شاهم، ئەمە موفتی زەهاوییە، شاش بە گاڵتەوە بە موفتی دەڵێت: (زهابی غبار آلوده شدەئی) واتە: (زەهاوی تەپووتۆزاوی بوویت)، موفتیش کتوپڕ دەڵێت:

---

(١) ئەمین زەکی بەگ لەو کتێبەدا دانانی ئەم مێژووە (١٢١٨ك) بۆ لەدایکبوونی موفتی بەدوور دەبینێت، نەك لەبەر ئەو هۆکارەی مامۆستای خاڵ لەسەرەوە باسی کردووە، بەڵکو بەهۆکارێکی تر، کە بریتیە لەوەی ساڵی لەدایکبوونی کوڕە گەورەی موفتی کە ناوی (عەبدوڵڵا ئەفەندی) بووە دەگەڕێنێتەوە بۆ (١٢٢٧)ك، بەو پێیەبێت موفتی (٩) ساڵ بووە کە (عەبدوڵڵا)ی کوڕی لەدایکبوو! کە ئەمەش دیارە دوورە لە ڕاستیەوە و ناگونجێت. بەڵام ئەوەی زیاتر کێشەکە قوڵ دەکاتەوە و گرفتەکە بە هەڵپەسێردراویی دەهێڵێتەوە ئەوەیە مامۆستای خاڵ لەم کتێبەدا — وەك لە دواتردا دێت– ساڵی لەدایکبوونی (عەبدوڵڵا)ی کوڕە گەورەی موفتی بە (١٢٤٧ك) دادەنێت، کە ئەم مێژووەش هیچ گرفتێك بۆ دانانی ساڵی (١٢١٨ك) بۆ لەدایکبوونی موفتی دروست ناکات! (ئامادەکار)

(٢) زەهاو: ناوچەیەکە لە کوردەواری ئێران، لە ناوەندی (هۆرێن) و (شێخان) و (قەصری شیرین)دا.

(٣) لە دوای شۆڕشی (١٤/تەموزی/١٩٥٨ز) ئەم نەخۆشخانەیە ناوی گۆڕدرا بە (نەخۆشخانەی کۆماریی)، کە ئێستا دەکەوێتە ناو شاری پزیشکیی بەغدادەوە. (ئامادەکار)

**غباری خاکپـــای شاه در هر دیده جـا دارد**

**ز فیض مقدمش در چشم هرکس توتیا دارد**[1]

واتە: تۆزی بەری پێی شا لە هەموو چاوێکدا جێگای هەیە، وە لە فەڕی هاتنی ئەوەوە (توتیا) – کە دەرمانێکی هەرە باشە بۆ چاو– لە هەموو چاوێکدا هەیە، واتە ئەم تەپووتۆزەی کە لێم نیشتووە تۆزی بەری پێی شایە.

لە پاشان (شا) بە موفتی دەڵێت: (زهابی چهار چشم شدئی) واتە: (چوار چاو بووی) –چونکە موفتی لەو کاتەدا چاویلکەی لەچاوا بووە–، ئەمیش دەڵێت:

**بر دیده عینك می نهم چون موسم دیدار شد**

**بهر تماشای رخت بنگر که چشمم چار شد**[2]

واتە: لە کاتی بینینتا چاویلکە لە چاو دەکەم، تا بە چوار چاو تەماشای دیدارت بکەم. شا لەگەڵ ئەم دوو شیعرە جوانە کتوپڕیە لە موفتی ئەبیسێت ئینجا لەبەری هەڵدەستێت و بە والی دەڵێت: (ز ماست) یەعنی (لە خۆمانە)، چونکە خەڵکی زەهاوە و ئێرانیە، والیش دەستبەجێ دەڵێت: (مادرش) واتە: (هەر دایکی زەهاوییە).

---

(١) ئەم شیعرەم بە چیرۆکەکەوە لە مەلا غالبی خانەقینی بیستووە، کە خۆی ئیجازەی لە موفتی زەهاوی وەرگرتووە.

(٢) ئەم شیعرەم لە مدرس مەلا محمد سەعیدی کوڕی حاجی مەلا ئەحمەدی دێلێژەیی بیستووە.

# خوێندن و مامۆستاکانی

وادیاره کە موفتی لە تەمەنی شەش حەوتساڵیدا لای مەلا ئەحمەدی باوکی دەستی کردووە بە خوێندن و بەرەبەرە سەرکەوتووە تا هێندێ نەحو و صەرفیشی خوێندووە.

تەنانەت لە شێخی باپیرم بیستووە دەیفەرموو: موفتی لە کاتی خوێندن و فەقێیەتیدا زۆر حەزی لە یاری کردووە و بۆ خوێندن هەوڵ و تەقەلایەکی چەندانی نەداوە و پێشەکی موتاڵای دەرسی نەکردووە، جا لەسەر ئەمە ڕۆژێ باوکی لێی توڕە دەبێت و سەرزەنشتی دەکات، موفتیش ڕقی هەڵدەسێت، ئەو ڕۆژە چاوێك بە دەرسەکەیا ئەخشێنێت، لە پاشا کە دەچێتە سەر دەرس، باوکی هەرچەند دەکات ناتوانێت دەرسەکەی پێ بڵێ، هەرچی دەڵێت موفتی خراپەیەکی لێ دەگرێت، لە پاشا باوکی دادەمێنێت، بە تەواوی دەوێسێت، ئینجا دەڵێت: ئاخر من لەبەر ئەمەیە کە موتاڵا ناکەم، لەسەر ئەمە باوکی ئیتر دەرسی پێ ناڵێت و ئەینێرێت بۆ لای زانای بەناوبانگ (شێخ مەعروفی نۆدێیی)[1] چەند ساڵێك لەلای ئەخوێنێت، عیلمی نەحو و صەرف و مەعان و بەیان و بەدیع و عەروزی زۆر چاك لەلا تەواو دەکات.

---

(١) ئەم پیرە لە ساڵی (١١٦٦ك) لە دێی (نۆدێ) لەدایکبووە و لە ساڵی (١٢٥٢ك) لە سلێمانی کۆچی دوایی کردووە و عومری (٨٦) ساڵ بووە، هەمووی بە نوسین و تەدریس بەسەربردووە، شەست و شەش (٦٦) تەئلیف و مەنـزومەی هەیە، زۆرترینی خوێندنی لای (ابن الحاج) بووە لە دێی (هەزارمێرد).

(لەم پەراوێزەدا مامۆستای خاڵ ساڵی (١٢٥٢ك) داناوە بۆ کۆچی دوایی شێخ مەعروفی نۆدێ، بەڵام هەر مامۆستای خاڵ خۆی لە کتێبی (الشيخ معروف النودهي البرزنجي)دا (ل٨٧) دەفەرموێت: شێخ مەعروف ساڵی (١٢٥٤ك–١٨٣٨ز) کۆچی دوایی کردووە. زۆربەی ئەو سەرچاوانەی کە باسیان لە ژیانی شێخ مەعروفی نۆدێ کردووە هەمان بەرواریان –(١٢٥٤ك) – داناوە بۆ کۆچی دوایی. (ئامادەکار).)

تەنانەت لە باپیرم بیستووە دەیفەرموو: کاتێك کە لە بەغداد دەرسی وتووەتەوە و فتوای داوە، لە ئیحتیفالاتی ڕەسمیدا خوتبەی زۆر جوانی خوێندووەتەوە، مەلاکانی بەغدا زۆر سەرسام بوون لە عەرەبی زانینی موفتی، بارەها[1] پێیان وتووە تۆیەك کە کوردی و لە کوردستاندا پێگەیشتووی ئەم عەرەبییە چۆن فێربووی؟ ئەویش بە خۆهەڵکێشانێکەوە فەرمویەتی: من لەلای شێخ مەعروفی نۆدێ عەرەبیم خوێندووە.

لە پاشا چووە بۆ هەڵەبجە لە مزگەوتی گەورە لەلای زانای بەناوبانگ (شێخ عەبدوڵڵای خەرپانی)[2] مەنتیق و فیقهو ئوصولی فیقهی خوێندووە.

---

(١) بارەها: وەشەیەکی فارسییە، واتە: چەندین جار. (ئامادەکار)

(٢) ئەم زانا بەرزە لە سالی (١١٩٠ك) لەدایکبووە و لە ساڵی (١٢٨٥ك) کۆچی دوایی کردووە.

(لە چاپی پێشوودا بەرواری کۆچی دوایی شێخ عەبدوڵڵای خەرپانی بە (١٢١٥ك) دانرابوو و دانانی ئەم بەروارەش جێی سەرنج و وەستانی کۆمەڵێك لە مێژوونووسان بووە.

(بابا مەردۆخی ڕۆحانی) لە (تاریخ مشاهیر کرد)دا (ب١/ ل٣٤٨) دەڵێت: هەڵەیەك لەم دوو بەروارەدا کە مامۆستای خاڵ باسی کردووە بۆ لەدایکبوون و مردنی خەرپانی ڕوویداوە، ڕاستیەکەی دەگونجێت بەم شێوەیە بێت: ساڵی (١١٧٠ك) لەدایکبووە و ساڵی (١٢٥١ك) کۆچی دوایی کردووە.

چونکە بەو پێیە بێت خەرپانی تەنها (٢٥) ساڵ تەمەنی بووە و لەگەڵ ئەوەشدا زانایەکی گەورە بووە و چەندین لە کەڵە زاناکانی کوردستان لای ئەو خوێندوویانە و ئیجازەی مەلایەتیان لەلا وەرگرتووە، ئەمەش ئەوە دەردەخات کە تەمەنی زۆر زیاتر بووە لە (٢٥) ساڵ. موفتی زەهاوی –لەسەر ئەو ڕایەی ساڵی (١٢٠٨ك) لەدایکبووە– لەو ساڵەی کە شێخ عەبدوڵڵای خەرپانی کۆچی دوایی کردووە، تەمەنی موفتی تەنها حەوت (٧) ساڵان بووە! ئەمەش ناگونجێت بۆ ئەوەی کە لەو تەمەنە کەمەدا موفتی لەلای زانایەکی گەورەی وەك خەرپانی مەنتیق و فیقهو ئوصولفیقهی خوێندبێت.

بەڵام پاش گەڕانەوەم بۆ نوسخەی دەستنوسی مامۆستای خاڵ، بۆم دەرکەوت کە هەڵەکە تەنها لە بەرواری کۆچی دوایی خەرپانیدا ڕوویداوە، (١٢٨٥ك) کراوە بە (١٢١٥ك).

لە چەند سەرچاوەیەکی تردا بەرواری لەدایکبوون و کۆچی دوایی شێخ عەبدوڵڵای خەرپانیان بەم شێوەیە داناوە: ساڵی (١١٥٩ك) لەدایکبووە و ساڵی (١٢٥٤ك) کۆچی دوایی کردووە و مامۆستای خاڵیش هەر ئەم مێژووەی پەسندکردووە لە وتارێکدا کە لەسەر شێخ عەبدوڵڵای خەرپانی نوسیویەتی و لە کتێبی (ناڵەی دەرون/ ل٢٠٥)دا بڵاوی کردووەتەوە. (ئامادەکار).)

تەنانەت دەگێڕنەوە دەڵێن: شێخ قادری ئامۆزای شێخ موستەفای موفتی هەڵەبجە کە لە نەتەوەی شێخ عەبدوڵڵا بووە، ئیدیعای وەقفییەتی باخ و ئاشی شێخ محەمەد ئەمینی کردووە بۆ مزگەوتی گەورەی هەڵەبجە و موفتی زەهاوی کە لەو کاتەدا موفتی بەغداد بووە بە شاهید پیشانی داوە، کە گوایا وەختی خۆی لەوێ فەقێ بووە و ئاگای لێیە، لەم ڕووەوە پرسیار لە موفتی کراوە، زەهاویش فەرمویەتی: (ئەشهەدوبالله خۆم لە مزگەوتی گەورەی هەڵەبجە لە خزمەت شێخ عەبدوڵڵادا فەقێ بووم و بارەها چوومەتە ئاشی شێخ محەمەد ئەمین بەکۆڵ مزەم[1] هێناوەتەوە بۆ ماڵی شێخ عەبدوڵڵا).

لە پاشا چووە بۆ (سنە) و لەلای شێخ سەعیدی تەختیی چەند مانگێك دەمێنێتەوە، چەند دەرسێکیشی لەلا دەخوێنێت، لە پاشا شێخ سەعید دەمرێت، ئینجا شیخ قادری کوڕی کە شارحی (تهذيب الكلام)ە لە جێگاکەی باوکی دادەنیشێت و دەست دەکات بە تەدریس[2]، بە موفتی دەڵێت کە دەرسی لەلا بخوێنێت، موفتیش دەڵێت: من دەرس لەلای تۆ ناخوێنم، جا لەسەر ئەمە —وەك لە شێخی باپیرم بیستووە کە لەلای شێخ قادر خوێندویەتی— شێخ قادر تا مردنی لە موفتی دڵگیر[3] بووە، هەرچەند ناوی موفتی برابێت پلارێکی تێگرتووە.

لە پاشان موفتی دەگوێزێتەوە بۆ مەدرەسەی مامۆستای گەورە شێخ محەمەد قەسیمی مەردۆخی[4] کە برا گەورەی شێخ سەعیدی تەختی ناوبراو بووە و مامۆستای

---

(١) مزە: دانەوێڵەیەکە کە ئاشەوان لە باراشی هەموو کەسێکی گل دەداتەوە، بەرامبەر بە هاڕینی. (فەرهەنگی خاڵ/ ل٥٥٦). (ئامادەکار)

(٢) شێخ قادر لە سلێمانی لە ساڵی (١٣٠٣ك) کۆچی دوایی کردووە.

(٣) دڵگیران: دڵتەنگ بوون. (فەرهەنگی خاڵ/ ل٢٣٧). (ئامادەکار)

(٤) شێخ قەسیم لە ساڵی (١٢٣٦ك) لە (سنە) کۆچی دوایی کردووە.

**مەولانا خالیدی نەقشبەندیی[1] بووە، چەند ساڵێك لەسەریەك لە خزمەتیدا عیلمی حیكمەت و كەلام دەخوێنێت، تا تەواویان دەكات.**

(١) مەلانا خالید لە ساڵی (١١٩٣ك) لە دێی قەرەداغ لە لیوای سلێمانی لەدایكبووە و لە ساڵی (١٢٤٢ك) لە شام كۆچی دوایی كردووە، ئەم پێشەوایە زۆر بەرز و خوێندەوارێكی ئێجگار باڵا بووە، بەڵكو هەڵكەوتوو بووە و تاقانەی وەختی خۆی بووە.

لە سلێمانیەوە بۆ ڕۆژهەڵات: تا شیراز و هەمەدان و سنە و ئەصفەهان و طوس و هیرات و غەزنین و قەندەهار و خەرقان و بوستام و سێمنان و نەیسابوور و كابوڵ و لاهور و سەمەرقەند و بوخارا و ئازەربیجان و هیندستان ...

بۆ ڕۆژئاوا: تا بەغداد و موسڵ و دیاربەكر و حەلەب و شام و فەلەستین و حیجاز...

گەڕاوە لە خۆی زاناتر و داناتر نەبووە.

ئەم زانایە گەلێك تەئلیفی هەیە:

١ـ شەرحی مەقاماتی حەریری.

٢ـ حاشیەی بەسەر خەیاڵی و عبدالحكیمی خەیاڵیەوە لە عیلمی كەلامدا.

٣ـ العقد الجوهري في الفرق بين كسبي الماتريدي والأشعري.

(عبد الحمیدی خەرپوتی شەرحی لەم كتێبە كردووە و ناوی ناوە: السمط العبقري في شرح العقد الجوهري).

١ـ دیوانێكی شیعر بە فارسی و عەرەبی و كوردی، كە لە ئەستەمبوڵ لە ساڵی (١٢٦٠ك) لە چاپ دراوە.

ئەم پێشەوایە بە هەزاران خەلیفەی وەك (ئیبن عابدین) و (سید مەحمود ئالوسی) و (مەلا یەحیای مەزۆری) و (شێخ ئەمینی سوەیدی) و (عوبەیدوڵڵای حەیدەری) و (شێخ عبدالرحمانی ڕوزبەهانی) و (شێخ سیراجەددین) و (سەید تەهای شەمزینان)ی بووە، تەریقەتی نەقشبەندی كرد بە تەریقەی خالیدی، بە هەموو جیهانی ئیسلامدا بڵاوی كردەوە.

گەلێ لە پێشەوا و خوێندەواری بەرزی خاوەن قەڵەم لە عێراق و سوریا و توركیا و حیجازدا لە تەرجەمەی مەولانادا كتێبیان نوسیوە، ئەوی من دیبێتم ئەمانەن:

١ـ (أصفى الموارد من سلسال أحوال مولانا الإمام خالد) تەئلیفی شێخ عوسمانی كوڕی سیندی وائیلی بەصریی.

٢ـ (الفيض الوارد على روض مرثية مولانا خالد) تەئلیفی موفەسیری گەورە سەید محمودی ئالوسی.

٣ـ (الأساور العسجدية في المآثر الخالدية) تەئلیفی شێخ حوسەینی دەسوری ئیحسائیی.

٤ـ (البهجة السنية في آداب الطريقة الخالدية) تەئلیفی شێخ محەمەدی كوڕی عەبدوڵڵای خانی.

ئینجا چووه بۆ سابڵاغ و له خزمەت پێشەوای بەناوبانگ مەلا محەمەدی مەشهور به ابن الرسول[1] (ریاضیات)ی خوێندووه، ئیجازەی لەلا وەرگرتووه، له پاشا هاتووەتەوه بۆ سلێمانی و دەستی کردووه به دەرس وتنەوه و خوێندەوار پێ گەیاندن.

---

٥- (المجد التالد في مناقب مولانا خالد) تەئلیفی ئیبراهیم فەصیحی حەیدەری بەغدادی.

٦- (الحديقة الندية والبهجة الخالدية) تەئلیفی محەمەدی کوڕی سلێمانی حەنەفی بەغدادی.

٧- (سل الحسام الهندي لنصرة مولانا خالد النقشبندي) تەئلیفی سەید محەمەدی مەشهور به (ابن العابدين).

٨- (السهم الصائب بالانتصار لمولانا خالد) تەئلیفی شێخ محەمەد ئەمینی سوەیدی بەغدادی.

٩- (القول الصواب بردّ ما سمّي بتحرير الخطاب) تەئلیفی محەمەد ئەمینی موفتی حیلله.

١٠- (بغية الواجد في مكتوبات حضرة مولاتا خالد) تەئلیفی محەمەد ئەسعەد صاحیب.

(١) ئەم پێشەوایه زۆر زانا و دانا و خاوەنی تەئلیفی زۆر بەرزه له عیلمی جەبر و هەیئەت و هەندەسەدا، له عیلمی کەلامدا حاشیەیەکی زۆر جوانی هەیه بەسەر (عبدالحکیم)ی خەیاڵیەوه له ساڵی (١٣٠٢ك) له ئەستەنبوڵ چاپ کراوه، ئەم زانایه له ساڵی (١١٨١ك) له دێی (چوارتا) له لیوای سلێمانی لەدایکبووه، له ساڵی (١٢٤٦ك) له (سابڵاغ) کۆچی دوایی کردووه.

# مایەی کۆچی لە سلێمانی

خۆم لە شێخی باپیرم بیستووە دەیفەرموو: لە پاش کۆچکردنی موفتی لە سلێمانی، ڕۆژێك یەکێك لە پیاوماقوڵانی سلێمانی —کە من ناوەکەیم لەبیرچووەتەوە— لە موفتی دەپرسێت کە بۆچی سلێمانیت بەجێهێشت؟ ئەویش دەڵێت: چونکە لە ناو زانایان و پێشەوایانی سلێمانیدا جێگام نەدەبووەوە و لە هیچەوە دیار نەبووم. لە پاشا دەڵێت: ڕۆژێك لە سلێمانی لە مزگەوتی مەلا عەبدوڵڵای ڕەش —کە ئێستا پێی دەڵێن مزگەوتی سەید حەسەن— مەلاکان هەموو کۆبووبوونەوە لەگەڵ مەلا عەبدوڵڵادا قسەیان لە مەسئەلەیەکی عیلمی دەکرد، منیش قسەیەکم تیاکرد، کەچی مەلا عەبدوڵڵا پێم دەڵێت: بۆچی ڕۆڵە تۆیش خوێندووتە؟!![1]

---

(١) کوا ئەمڕۆ ئەو مامۆستا و زانایانی خاکی پاکی سلێمانییەی کە بلیمەتێکی وەك موفتی زەهاوی لەبەریان هەڵبێت؟

کوا ئەو پێشەوا و هەڵکەوتووانەی سلێمانی کە لە ناوچەی خۆیاندا دەفیان دەنگی نەداوە، بەڵام لەدەم گەلی بێگانان وەك ڕۆژ هەڵهاتوون؟

کوا ئەو نەهەنگانەی کە لە ناوچەی سلێمانیدا هەڵیان نەکردووە، تا ناچار ڕوویان کردووە بۆ دەریای دوور و بە هاتن و کشانەوە (مەدد و جەزر)ی دەریای زانایيان جیهانێکیان تێراو و پاراو و زیندوو کردووەتەوە؟

کوا ئەو شێری شێرخۆرانە و پڵنگی خوێن خۆرانەی کە لە بێشەو لانەی سلێمانیدا دەرچوون و لە جەنگەڵستان و لێڕەواری جیهاندا بڵاوبوونەتەوە، لەسەر پاشماوەی خوانی زانایيان هەزاران شێر و پڵنگی تر ژیاون و کاسەلێسیان کردووە؟

کوا ئەو ئەستێرە و مانگ و ڕۆژانەی کە لە ئاسمانی لیوای سلێمانیدا ئاوابوون و بە ئاسمانی بێگانانەوە ورشە و پرشە و بریسکە و تریسکەیان هاتووە و هەزاران سەرلێشێواو بەهۆی ڕووناکیانەوە ڕێگایان دۆزیوەتەوە؟

کوا (ابن الصلاح)ی شارەزووری کە پێشەوایەکی وەك ئیمامی نەوەوی —کە پێی دەڵێن شافیعی دووەم— لە کۆڕی تەدریسیا لەگەڵ هەزارانی وەك خۆی بەچۆکا هاتووە و ئەژنۆی داداوە و گوێچکەی بۆ گرتووە؟

کوا (ابن الحاجب)ی شارەزووری خاوەنی (کافیە) و (شافیە) و (مختصری منتهی)؟
کوا مەلا ئەحمەدی گۆرانی شارەزووری مامۆستای سوڵتان محەمەد فاتیح؟
کوا شێخ عبدالکریمی شارەزووری کە بزانێکی وەك یوسف الأصم لەبەردەستیا پێگەیشتووە؟
کوا شێخ ئەحمەدی شێخ ئیلیاسی شارەزووری زانا و شاعیری بەناوبانگ ؟
کوا شێخ عبدالکریمی بەرزنجەیی کە شێخ عەبدوڵڵای خەرپانی و مەولانا خالیدی نەقشبەندی و مەولانا ئیبراهیمی بیارەیی و هەزارانی تر بەهرەمەند بوون لە دەریای دانایی و زانایی ئەو؟
کوا مەولانا خالیدی نەقشبەندی شارەزووری، کە پێشەوای وەك مەلا یەحیای مەزۆری و سەید مەحمودی ئالوسی و (ابن العابدین) گوڵەوچن بوون لە خەرمانی دانایی و زانایی ئەو؟
کوا (ابن الحاج)ی جێشانەیی و مەلا عەبدوڵڵای بێتوشی و مەولانا ئیبراهیمی بیارەیی و ئەلمەعی بەرزنجەیی و شێخ مارفی نۆدێی و شێخ عەبدوڵڵای خەرپانی و مەلا جەلالی گەورە و مەلا عەبدوڵڵای ڕەش و کاك ئەحمەدی شێخ...؟
کوا شێخ عبدللطیفی گەورە و مەلا صادقی تەوێڵەیی و مەلا محەمەدی ابن الخیاط و مەلا ئەحمەدی نۆتشەیی موفتی سلێمانی و مەلا عەلی قزڵجی و موفتی چاومار؟
کوا مەلا عبدالرحیمی مەولەوی تاوەگۆزی، فیردەوسی کورد لە شیعری فارسی و موتەنەببی کورد لە شیعری عەرەبی و خواوەندی شاعیرانی کورد لە شیعری کوردیدا؟
کوا مەلا عبدالرحمانی پێنجوێنی و مەلای بیارە و شێخ عومەری قەرەداغی؟ کوا؟ کوا؟ کوا؟
ئەمانە نمونەیەکن لە زانایانی خاکی پاکی سلێمانی کە ساڵەهای ساڵ خۆیان و کۆڕی قوتابی و تەدریسیان بە ئاسمانی زاناییەوە وەك حەوتەوانە بریسك و هوڕیان هاتووە، بەڵام داخی بەجەرگم ئێستا گەلێك لە مزگەوت و مەدرەسەکانیان چۆڵ و هۆڵ و لە جێی گەلێك لەم شابازانە یان قەلەڕەشێك ئەقرێنێ، یان کوندەپەپویەك دەخوێنێ. (لەجێی شابازان کۆر کۆرە وازان)

**مینبەر و میحراب و مزگەوت بێ کەسە**

**هەر مەپرسە حاڵی چۆنە مەدرەســــە!**

(وشەی (لێڕەوار) –کە لە سەرەتای ئەم پەراوێزەدا بەکارهاتووە– واتە: دارستانی چڕ و پڕ. (فەرهەنگی خاڵ/ ل٥٤٢).

تێبینییەك: مامۆستای خاڵ لە سەرەتای ئەم پەڕاوێزەدا فەرموی: ئیمامی نەوەوی لەلای (ئیبنوسەلاحی شارەزوری) خوێندویەتی و قوتابی ئەو بووە، بەڵام ڕاستییەکەی ئەوەیە کە ئیمامی نەوەوی (ئیبنوسەلاحی) نەبینیوە و لە لای نەیخوێندووە، چونکە (ئیبنوسەلاح) لە ساڵی (٦٤٣ك) کۆچی دوایی کردووە، نەوەوی ساڵی (٦٣١ك) لەدایکبووە و –وەك لە هەموو سەرچاوەکاندا هاتووە– نەوەوی لە نۆزدا

دووباره دەگێڕنەوە: حاجی مەلا ڕەسوڵ ناوێك بووە لە سلێمانی لەسەر ئەم مزگەوتەی کە ئێستا پێی دەڵێن مزگەوتی (شێخ عبدالرحمانی عازەبانی)، فەقێی موفتی بووە، هەموو ڕۆژێك چووە بۆ لای موفتی بۆ دەرس خوێندن، ڕۆژێك موفتی لە پرسە (تەعزیە)یەك دەگەڕێتەوە کە دەگاتە بەر مزگەوتەکەی حاجی مەلا ڕەسوڵ نەختێك لادەداتە لای، لە پاشا هەرلەوێ دەست دەکات بە دەرس وتن بە حاجی مەلا، لەو دەمەدا بە ڕێکەوت (مەحمود پاشا)ی حاکمی بەبە[1] بەسوارییی لە تەعمیرکردنەوەی خانەقای مەولانا دەگەڕێتەوە و لەبەر باران لا ئەداتە مزگەوتەکەی حاجی مەلا، کە تەماشا دەکات، وا مەلا محەمەد فەیزی و حاجی مەلا ڕەسوڵ سەرو کتێبێکیان بەدەستەوەیە، بەڵام نازانێ چیدەکەن، کامیان لای کامیان دەرس دەخوێنن، تۆزێك دادەنیشێت، لە پاش خۆشکردنەوەی بارانەکە، مەحمود پاشا سوار دەبێتەوە و دەچێت بۆ سەرا، ئەمانیش دەرسەکەیان تەواو دەکەن.

لە پاش چەند ڕۆژێك حاجی مەلا ڕەسول دەچێتە لای مەحمود پاشا پێی دەڵێت پاشا! هەر پێم دەوتیت کە مەلا محەمەد فەیزی مەلا نیە، پێت باوەڕ نەدەکردم، تا خۆت دییت کە لەبەردەمما دەرسی دەخوێند، مەحمود پاشا پێی باوەڕ دەکات، موفتی لە پاش ئەوە هەرچەند دەچێت بۆ لای پاشا بە ساردوسڕی ئەیبینێ و نازانێ لەبەر چیە، لە پاشا کە دەکۆڵێتەوە و دەچێتە بنج و بناوانی تێدەگات، لەمە زۆر دڵ شکست دەبێت، ئیتر دەکەوێتە خولیای بەجێهێشتنی سلێمانی.

نەخوازەڵا کە (ئەحمەد بەگی موسلیم)یش لە کەرکوکەوە کاغەز دەنوسێت بەشوێنیدا و تکای لێدەکات کە بچێت بۆ کەرکوك و ببێت بە مودەڕڕیسی ئەو، ئیتر

---

(١٩) ساڵیدا دەستی کردووە بە خوێندن، بۆیە ناگونجێت لە کۆڕی (ئیبوسەلاح)دا دانیشتبێت و زانستی لا خوێندبێت. (ئامادەکار).)

(١) بەبە: واتە بابانیەکان. (ئامادەکار)

موفتی بە خاو و خێزانەوە دەچێت بۆ کەرکوك و سلێمانی بە ئێجگاری بەجێ دەهێڵێت.

تەنانەت (کاکە حەمە)ی کوڕی ئەم حاجی مەلا ڕەسوڵە خۆی گێڕاویەتیەوە بۆ عبدالرحمان بەگی بابان دەڵێت: لە گرانیە گەورەکەی ساڵی (١٢٩٦ك)دا چ خۆم و چ مەلا قادری برام، یەکی بە کۆشێك خێزانەوە وەختەبوو بمرین لە برسانا، ناچار بە پێ چووم بۆ بەغداد بۆ لای موفتی زەهاوی، چونکە بیستبووم کە بۆ مەلای کورد وەك باوك وایە، دەڵێت: کە چوومە دیوەخانەکەی موفتی، دیم پڕ بوو لە مەلای کورد، لە پاش ماندوونەبوونی، موفتی لێی پرسیم کوێندەرییت؟ وتم: خەڵکی سلێمانیم، فەرموی کوڕی کێیت؟ وتم: کوڕی حاجی مەلا ڕەسوڵم، ئینجا موفتی ڕووی کردە مەلاکان و وتی: مەلایینە! وەختی خۆی باوکی ئەمە منی لە سلێمانی دەربەدەر کرد، موفتی داستانەکەی خۆی و باوکمی لە نوکەوە گێڕایەوە، کاکە حەمە دەڵێت لەگەڵ لە قسەکە بووەوە کتوپڕ هەستامە سەرپێ و وتم: بەخوا قوربان! هاتووم داوای پاداشتی ئەو پیاوەتیەی باوکمت لێدەکەم کە بەسەرتەوە هەیە. موفتیش بە توڕییەوە وتی: پیاوەتی چی؟!! منیش وتم: قوربان ئەگەر وەختی خۆی باوکم دەربەدەری نەکردیتایە لە سلێمانی، ئەمڕۆ لە کوێ موفتی بەغداد دەبویت؟ موفتیش وتی: بەڕاستی کوڕی باوکی خۆتی.

کاکە حەمە دەڵێت: لەو ساڵە گرانیەدا، موفتی کردمی بە وەکیلی خۆی بەسەر زەوی و زارەکانیەوە لە (دیالە)، منیش هەر ئەو ڕۆژە کاغەزم نوسی بە شوێن مەلا قادری براما، کە بە خاو و خێزانیەوە بێن بۆ ئەوێ، کاکە حەمە دەڵێت: لەو ساڵە کووڕەدا، خۆم و مەلا قادری برام و ماڵ و منداڵمان وەك شا ڕامان بوارد، لە پاشا هەر ئەم کاکە حەمەیە بوو لە سایەی موفتییەوە بوو بە قایمقام.

# تەدریس و موفتیێتی زەهاوی

موفتی لە پاش ئیجازەوەرگرتنی لە سابلاغ، هاتووەتەوە بۆ شاری سلێمانی، چەند ساڵێك لەم مزگەوتەی کە ئێستا پێی دەڵێن مزگەوتی (شێخ بابا عەلی) تەدریسی کردووە و خوێندەواری پێگەیاندووە.

لە پاشا لەسەر کاغەز و تکای (ئەحمەد بەگی موسلیم) کە باپیری حوسەین بەگی نەوت چیە چووە بۆ کەرکوك وە بووە بە مودەڕڕیسی مزگەوتی (موسلیم) لە گەڕەکی (قۆریە) و ئەحمەد بەگ زۆر حورمەتی گرتووە و خزمەتی کردووە، چەند ساڵێکیش موفتی لەوێ تەدریسی کردووە و خوێندەواری بەرزی پێگەیاندووە، تا ئەحمەد بەگ لە لایەن والی بەغداد (عەلی ڕەزا پاشا) داوا دەکرێت، لە پاش چوونی بۆ بەغداد، والی دەیگرێت و لە بەندیخانە توندی دەکات، موفتی کە ئەمە دەبێت کتوپڕ دەچێت بۆ بەغداد و لەسەر تکای ئەم، والی بەری دەدات، لە پاشا والیش تکای مانەوە لە زەهاویی دەکات و لە بەغداد گلی دەداتەوە.

موفتی لە ساڵی (١٢٥٧ك) مودەڕڕیس بووە لە کەرکوك، تەنانەت (عبدالحكيم)ی کوڕی لەم ساڵەدا لە کەرکوك لەدایکبووە، لەمەولاش دەردەکەوێ لە سەرەتای (شیعری لاوەندنەوە)یدا کە موفتی لە ساڵی (١٢٦٠ك) لە بەغداد مودەڕڕیس بووە، کەوابوو موفتی لە ناوەندی ساڵی (١٢٥٧) و (١٢٦٠ك)دا بە ئێجگاری لە کەرکوکەوە چووە بۆ بەغداد.

موفتی لە ساڵی (١٢٦٦ك)دا بووە بە (رئيس المدرسين) تا ساڵی (١٢٧٠ك)، لەم ساڵەوە لە لایەن والی (گوزلگی ڕەشید پاشا)وە کراوە بە موفتی بەغداد و لە شوێنی موفتی کۆن (حاجی محەمەد ئەمین ئەفەندی زەند) دانرا، بە موفتیێتی ماوەتەوە تا

سالّی مردنی، ئینجا بە بۆنەی بوونیەوە بە موفتی شاعیری عێراق (عبدالباقی عومەری) لە مەدحیا دەڵێت:[1]

**قد قيل لي إذا رحت أنشد عندما**

**شــاهدت دين مــحمد يتجـــدد**

**في مذهب النعمـــان بالــزوراء قد**

**أفتى الإمــام الشـــافعي محمد**[2]

موفتی لە تەمەنی بیست ساڵییەوە دەرسی وتووەتەوە تا مردنی، واتا (٨٠) ساڵ لەسەریەك تەدریسی کردووە، لە کارخانەی زانایی و دانایی خۆی، مەلا و زانایانی دروست کردووە و داناو پێشەوایانی پێگەیاندووە، (٣٨) ساڵیش لەسەریەك لە ئاخیری عومریا موفتی بەغداد بووە و لەگەڵ تەدریسا فتوایشی داوە.

---

(١) بڕوانە: الترياق الفاروقي أو ديوان عبد الباقي العمري. ل ٣٧٥. (ئامادەکار)

(٢) وادیارە ئەم شیعرانە لە کاتێکدا وتراون کە موفتی هێشتا هەر شافعی بووە و نەبووە بە حەنەفی.

# پایەی زانینی

موفتی تا بڵێیت زانا و دانا و پایەی زانینی بڵند بووە، لە پایەی عیلمییدا پایەی (حەرەمەین)ی بووە، لە عیلمی نەحو و صەرف و مەعان و بەیان و بەدیع و وەزع و عەروز و کەلام و مەنتیق و ئاداب و حیکمەت و فیقهو ئوصولفیقهو حەدیس و ئوصولولحەدیس و تەفسیر و حیساب و هەندەسە و تەشریحولئەفلاکدا پێشەوا و پایەیەکی ئیجگار بەرزی بووە، ئەگەر کتێبی ئەم عیلمانە نەمایە ئەیتوانی لەبەر کتێب بۆ هەموویان دابنێت، بەڵکو خاوەنی بیری خۆی بووە.

ئەگێڕنەوە کە لە حاجی مەلا عەبدوڵڵای کۆیەیان پرسیوە کە ئەندازەی مەلایەتی تۆ لەگەڵ موفتی زەهاوی دا چۆنە؟ ئەویش فەرمویەتی: هەردووکمان مەلاین، بەڵام هەرچێکو منم زانینەکەم تابعی کتێبە، وەلێ کتێب تابعی زانینی موفتیە.

شێخ ڕەزای تاڵەبانی لە باسی پایەی زانایی موفتیدا، دوو شیعری کوردی هەیە دەڵێت:

**ئەی مادەری گیتی تۆ هەتا ئێستا نەزاوی**

**زاتێکی وەکو فەیزی ئەفەندی زەهـــاوی**

**مومکین نیە ئیدراکی حەقایق بە تەواوی**

**مومکین نیە ئیدراکی نەکا زیهنی زەهاوی**(١)

لە مامۆستای زانا جەنابی مەلا محەمەد ئەفەندی قزڵجیم بیستووە کە پێشەوای بەناوبانگ سەید مەحمود ئەفەندی ئالوسی خاوەنی تەفسیری (روح المعاني) لە

---

(١) بڕوانە: دیوانی شێخ ڕەزای تاڵەبانی. (ل٢٠٩).(ئامادەکار)

بەغداد موفتی بووە، زەهاویش مودەڕڕیسی مەدرەسەی عیلمی بووە، (فازلی دەربەندی) — کە زانایەکی ئێرانی زۆر بەرز و بەناوبانگ بووە— هاتووەتە بەغداد، بەتایبەتی چووەتە سەر سەید مەحمودی ئالوسی بۆ موناقەشەی عیلمیی و موجادەلەیەکی زۆر دوور و درێژی مەزهەبیی لەگەڵدا کردووە، لە پاش چەند سەعاتێك سەید مەحمود تێدەگات کە بۆڕ دەخوات[1]، خێرا بە دزیەوە عبدالسلام ئەفەندی شەوواف —کە گەنجێکی زۆر خوێندەوار بووە— دەنێرێت بە شوێن زەهاویدا، کە زۆر زوو بگات بە فریایدا، تا فازیلی دەربەندی بۆڕی نەداوە و نەیشکاندووە، موفتیش بە پەلە پەل سواری کەرە سپیەکەی دەبێت و بە عبدالسلام ئەفەندی دەڵێت کە لغاوی کەرەکەی بۆ ڕاکێشێت تا ماڵی سەید مەحمود، لەو ماوەیەدا چاو دەقونجێنێت و هەر مەسئەلەیەك کە زانیبێتی لەو موناقەشەیەدا دەر میان دەکرێت هەمووی ئامادە دەکات، کە لەگەڵ دەگاتە ئەوێ قسە لە دەم سەید مەحمود دەقۆزێتەوە، ڕووی فازڵی دەربەندی دەکاتە خۆی و هەر لەوێدا بۆڕی ئەدات، کتوپڕ ئەم دوو شیعرە عەرەبییەی بەسەرا هەڵدەدات:

**مبحثُ العــلم معركٌ والالبــا**
**ءُ كُـــماةٌ وفاقدُ الكتب عُـزل**

**والصموتُ الفرار والنطق كرّ**
**والجدالُ القتال والبهت قتل[2]**

واتە: مەسئەلەیەکی عیلمی —کە چەند کەسێك قسەی لێدەکەن— وەك مەیدانی جەنگ وایە، زانایان و قسەکەرانی ئەو کۆڕە وەك پاڵەوان وان، بێ کتێب بێ چەکە،

---

(١) بۆڕخواردن: دەمکوتبوونی یەکێك لە قسە و گفتوگۆیەکدا.(فەرهەنگی خاڵ.ل٤٥).(ئامادەکار)

(٢) ئەم دوو شیعرەم لە مەلا غالبی خانەقینی بیستووە و لە پشتی تەهزیبێکی شێخ عەلی قەرەداغیش نوسراوە، کە ئێستا لە خانەقین دادەنیشێت.

بێدەنگبوون شکان و پشت هەڵکردنە، هاتنەوە قسە گەڕانەوە و هەڵمەت بردنە، موجادەلە و قسەکردن جەنگ و شەڕە تفەنگە، بۆڕخواردن کوژرانە.

بەپێی شیعرەکەی پاشوو وا دەردەکەوێت کە موفتی ئەم جۆرە موناقەشەی ئێجگار زۆر بووە لەگەڵ زانایان و خوێندەواراندا و بە تەواوی لەم ڕووەوە قاڵ بووە و کوڵاوە و مێشکی دڕاوە و بیری هەزاران پلە تیژترە و قوڵ تر بووە. وەك خۆی بە خۆی دەڵێت:

**فـــكري دقيـق في الــعلوم لأنه**

**دارت عليه رحى الجدال سنينا**[1]

واتە: تابڵێیت بیرم ورد و قوڵە لە هەموو عیلمەکاندا، چونکە ساڵەهای ساڵ بەرداشی موجادەلە وای بەسەردا گەڕاوە، وەك ئارد هاڕیویەتی.

بەسە بۆ بەرزیی پایەی زانایی موفتی کە پێشەوای وەك سەید مەحمودی ئالوسی خاوەنی تەفسیری (روح المعاني) لە کاتی نوسینی تەفسیرەکەیدا، هەرچەند گرێیەکی هاتبێتە پێش بە نوسین پرسیاری لێ کردووە، ئەمیش وەڵامی بۆ نوسیوەتەوە، گرێکانی دڵی بەسەر پەنجەی بیر یەك یەك بۆ کردوەتەوە و سەیدی ئالوسیش وەڵامەکانی بەناوی موفتیەوە لە تەفسیرەکەیدا نوسیوە.[2]

---

(١) ئەم شیعرەم لە زین العابدینی کوڕی مەلا فانی بیستووە.

(٢) یەکێك لەو جێگانەی کە سەید مەحمودی ئالوسی لە تەفسیرەکەیدا ناوی موفتی زەهاوی دەبات، لە تەفسیری سورەتی (المؤمنون) ئایەتی (١٨) لە (ب١٨/ل٣٠٣)دا دەڵێت: (وقد زاد بعض أجلة أهل العصر، العاصرين سُلاف التحقيق من كَرْم أذهانهم الكريمة أكرم عصر، أعني به ثالثَ الرافعي والنواوي، أخي الملا محمد أفندي الزهاوي، فقال:...). واتە: (چەند خاڵێکی زیاتری باس کردووە کەسێك لە پیاوە گەورەکانی ئەم سەردەمە، کە پاڵفتەی شەرابی لێکۆڵینەوەی پاڵاوتووە لە ترێی بیری مەزنی خۆیەوە بە باشترین پاڵاوتنێك، مەبەستم لە سێیەمینی ئیمامی ڕافعیی و نەواویە، برام مەلا محەمەد ئەفەندی زەهاوییە، فەرمویەتی:...).(ئامادەکار)

ئیبنو حەجەرەکەی[1] موفتیم دی لە سلێمانی لای حاجی مەلا عزیزی بالیکەدەری —کە لە لایەن حاجی عەلی ئاغاوە وەقف کراوە لە مەلا محەمەد ئەمینی بالیکەدەری— لە دواییەکەیەوە بە دەستی خۆی بە عەرەبی لێی نوسیوە: (لقد وُفقتُ والحمد لله على تقرية هذا الشرح وتصحيحه إلا ما زاغ عنه البصر، وزلّ عنه النظر، فلقد قيل: أبى الكتاب أن يصحّ، وأنا الحقير الفقير إليه عزّ وجلّ، محمد الشهير بالزهاوي المدرس بالمدرسة العلمية).

واتە: ئەم ئیبنو حەجەرەم هەموو بە دەرس وتەوە و شوێنە هەڵەکانیم ڕاست کردەوە، مەگەر جێگایەکی نەبێت کە بەرچاو نەکەوتبێت، چونکە هەروەك وتراوە کتێب هەرگیز بەتەواوی ڕاست نایەت، من زەهاویم کە مامۆستام لە مەدرەسەی عیلمی.

موفتی عیلمەکانی ئەمەندە ڕەوان بووە هەرچەند کەوتبێتە موناقەشەیەکی عیلمیەوە وەك سوارچاك لە دەشتێکی نەرماندا لنگ بدات، چۆن بە ئاسانی بە هەموو لایەکدا تاو ئەدات، وڵاخەکەی ئەئاخێوێ[2] و بە ڕاست و چەپدا چەرخە و مقەستەی پێ دەکات، لە هەر شوێنێك کە بیەوێت دای دەکوتێت، ئەمیش لە مەیدانی موناقەشەی عیلمیدا وابووە، هەرچەند ویستبێتی وەك بروسکە تاوی داوەتە سەر بەرامبەرەکەی و ئەمەندەی هێناوە و بردووە و ڕەتاندووە[3] تا بۆڕی داوە.

موفتی لە بەغدادا وەك قەڵایەکی ئاسنین وابووە لەبەر سێڵاوی[4] ئاخوون و موجتەهیدەکانی ئێراندا، کە هەمیشە هاتوون بۆ عێراق، هەموو جارێك کۆڕی

---

(١) وادیارە مەبەستی مامۆستای خاڵ لە ئیبنو حەجەر کتێبی (تحفة المحتاج)ە کە دانراوی ئیبن و حەجەری هەیتەمییە، لە فیقهی مەزهەبی شافیعیدا، چونکە ئەم کتێبە زۆر لە ناو مەلای کورددا بڵاوبووە و سەرچاوەی یەکەمیان بووە لە بۆ فتوادان. (ئامادەکار)

(٢) ئاخاوتن: لنگدانی وڵاخ و گێڕانی. (فەرهەنگی خاڵ. ل١). (ئامادەکار)

(٣) ڕەتاندن: هێنان و بردن و ماندووکردنی گیاندار. (فەرهەنگی خاڵ. ل٢٨٠). (ئامادەکار)

(٤) سێڵاو: وشەیەکی فارسییە، واتە: لافاو. (ئامادەکار)

موناقەشەیان بۆ گرتوون و بە هەزاران زانا و دانا و خوێندەواران دانیشتوون لە والی و موشیرەوە تا هەموو خوێندەوار و خاوەن پایەیەك، هەموو جارێك پاڵەوانی ئەم مەیدانە هەر موفتی، هەمیشە هەر زاڵیش بووە، بە ڕەنگێکی وا کە ناوبانگی موفتی زەهاوی لە هەموو قەڵەمڕەوی عوسمانی و ئێراندا بڵاو بووەتەوە، دەنگی داوەتەوە، لەبەر ئەمە خەلیفەی ئیسلام بەتایبەتی میهرەبانیەکی ئێجگار زۆری بووە لەگەڵ موفتیدا، تەنانەت بە مردنی موفتی سەعید ئەفەندی کوڕی کراوە بە موفتی بەغداد.

وادیارە دوژمنایەتی ئاخوند و موجتەهیدەکانی ئێران لەگەڵ موفتی دا گەیشتبێتە ئەندازەیەك کە گەلێ کەس لە ژیانی موفتی ترسابێت و بیمی[1] لێ نیشتبێت، وەك دەردەکەوێت لەم دوو شیعرە عەرەبییەی خۆیەوە کە دەڵێت:

**إنّــا نقول الــحقَ بالمحافل**

**ونبطل البـــاطل بـاــلدلائل**

**ولا نخاف لـــومةً مــن لائم**

**ولا نهاب صولةً من صائل**[2]

واتە: ئێمە قسەی هەقی خۆمان دەکەین لە هەموو مەجلیسێکدا، شتی ناڕەوا بە درۆ دەخەینەوە بە بەڵگەو نیشانە، نە لە لۆمە و تەشەر، نە لە دەستوەشاندنی کەس دەترسین.

دەگێڕنەوە کە والی بەغداد سلێمان نەزیف وتویەتی: هەموو خاکی دەوڵەتی عوسمانی و تەواوی قەڵەمڕەوی شانازی دەکات بە موفتی زەهاوییەوە.

ئەگەر ڕاستت دەوێت ئەندازەی زانایی موفتی لە ئێمەوە باش دەرناکەوێت، بەڵام خۆی شیعرێکی فارسی هەیە لە باسی زانایی خۆیدا، دەتوانین بیکەین بە ئاوێنەیەکی باڵا نماو تەماشای ئەندازەی زانایی ئەوی تیا بکەین، دەڵێت:

---

(١) بیم: وشەیەکی فارسییە، واتە: ترس. (ئامادەکار)

(٢) ئەم ڕوباعییەم لە ڕەئوف ناجی کەرکوکی بیستووە.

**گر بحر علومم به تلاطم زدن آید**

**در لــجهء اول فگنم حیدریان را**

واته: ئەگەر دەریای زانابیم بێتە جۆش و خرۆش بە یەکەم شەپۆل هەرچی عولەما و زانایانی خانەدانی حەیدەریی هەیە بە جارێ ئەیخەمە کەنارەوە.[1]

موفتی هەروەك زانایەکی بەرز بووە، خەتیبێکی کتوپڕیش بووە، دەگێڕنەوە کە (سوڵتان موراد) عەزل کراو (سوڵتان عبدالحمید) لە شوێنی دانرا، برقییەیەکی نهێنی (سیڕڕی) دێت بۆ والی بەغداد، والیش بەبێ ئەمەی بە کەس بڵێت هەرچی پیاوی گەورەی بەغداد هەیە کۆی دەکاتەوە لە دیواندا، ئینجا خۆی برقیەکە دەخوێنێتەوە، لە پاشا بە موفتی دەڵێت: لەم ڕووەوە خوتبەیەك بخوێنەرەوە، موفتیش کوتوپڕ خوتبەیەکی عەرەبی زۆر جوان هەڵ دەبەستێت و ئەوەڵی خوتبەکە بەم ئایەتە دائەمەزرێنێت کە دەفەرموێت: {قُلِ اللَّهُمَّ مَالِكَ الْمُلْكِ تُؤْتِي الْمُلْكَ مَنْ تَشَاءُ وَتَنْـزِعُ الْمُلْكَ مِمَّنْ تَشَاءُ وَتُعِزُّ مَنْ تَشَاءُ وَتُذِلُّ مَنْ تَشَاءُ بِيَدِكَ الْخَيْرُ إِنَّكَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ} ﴿آل عمران:٢٦﴾، لە پاشا خوتبەکەی تەواو دەکات، حازرین هەر بە ئایەتەکە سەرسام دەبن، هەروەك لە عومری خۆیان نەیانبیستبێت وا دەزانن.

---

(١) خانەدانی حەیدەریی خانەوادەیەکی عیلم بوون لە کوردەواریدا سێ سەد ساڵ لەسەر یەك تەدریس و تەئلیفیان کردووە.

# هێزی حافیزەی[1]

موفتی مێشك و بیرێكی ئێجگار بەهێزی هەبووە، هەرچیەكی خوێندبێتەوە یا بیستبێتی، كتوپڕ هاتووەتە بەری.

تەنانەت دەگێڕنەوە: (حاجی موستەفای كوببە) —كە یەكێك بووە لە دەوڵەمەندانی بەغداد— لە حەج دێتەوە، شاعیرێكی نەجەفی قەسیدەیەك لە مەدحیا دەنوسێت، بەتایبەتی لەكاتێكدا بۆی دەخوێنێتەوە كە موفتی لە لای بێت، تا پەسەندی بكات، كە لە خوێندنەوەی دەبێتەوە، موفتی بە گاڵتەوە دەڵێت: ئەم قەسیدەیە كۆنە، من دەمێكەیە لەبەرمە، دەست دەكات بە خوێندنەوەی تا دوایی، كابرای شاعیر ئەحەپەسێ و لە شەرما چاو دادەخات، ئینجا موفتی بائەداتەوە دەڵێت: گاڵتە دەكەم، ئەم شیعرانە شیعری خۆیەتی، زۆر ئافەرینی كابرای شاعیر دەكات.

دووبارە دەگێڕنەوە: كە ئاخونێك دەبێت هەمووساڵێك لە ئێرانەوە دێت بۆ بەغداد، لەگەڵ موفتی موناقەشەی مەزهەبیی دەبێت، هەموو نۆرەیەك زەهاوی بۆڕی دەدات، ئاخون چەند ساڵێك ون دەبێت، لەو ماوەیەدا دەست دەكات بە جستوجو و تەماشاكردنی كتێب و خۆئامادەكردن، كتێبێك دەنوسێت بەلای خۆیەوە كە موفتی پێ بۆڕ بدات، ئینجا دێت بۆ بەغداد و یەكشەق[2] دەچێت بۆ مەدرەسەی موفتی، لەو كاتەدا موفتی لەوێ نابێت، ئەم دەچێتە لای فەقێكانی موفتی و دەست دەكات بە تەعریفی كتێبەكەی خۆی، یەكێك لە فەقێكان بە دزییەوە خەبەر دەبات بۆ موفتی، موفتیش دەڵێت تۆ بچۆرەوە بۆ لای ئاخوند، منیش وادێم، لە پەنجەرەكەوە گوێ

---

(١) واتە: هێزی لەبەركردن و دەرخكردنی. (ئامادەكار)

(٢) یەكشەق: یەكسەر. (یەكشەق كردی بە ماڵدا): واتە بەبێ پرس. (فەرهەنگی خاڵ/ ل٦٥٩).(ئامادەكار)

دەگرم، بە هەر ڕەنگێك دەبێت لە سەرەتای کتێبەکەیەوە دە (١٠)، لە ناوەڕاستیەوە دە (١٠)، لە دواییەکەیەوە دە (١٠) لاپەڕەی پێ بخوێنەرەوە، فەقێکە دەگەڕێتەوە، تکا لە ئاخوند دەکات کە هێندێ لە کتێبەکەی بۆ بخوێنێتەوە، ئاخوند لە سەرەتاوە دەست دەکات بە خوێندنەوەی تا دە (١٠) پەڕە، ئینجا دە (١٠) پەڕەش لە ناوەڕاستەوە و دە (١٠) پەڕەیش لە دواییەکەیەوە بۆی دەخوێنێتەوە، لە پاشا موفتی دەچێتە ژوورەوە، لە دوای چاك و چۆنی میعادی موناقەشە دادەنێن، لە والیەوە تا هەموو پیاوە گەورەکانی بەغداد کۆدەبنەوە، ئینجا دەست دەکەن بە موناقەشەکردن، ئاخون کتێبەکەی دەهێنێتە پێشەوە، موفتی دەڵێت: ئەو کتێبە چیە؟ ئەویش دەڵێت: فلان کتێبە تەئلیفی خۆمە، موفتیش دەڵێت: تەئلیفی تۆ نیە، من دەمێکەیە ئەو کتێبەم دیوە، ئاخون دەڵێت: ئەمساڵ تەواوم کردووە، تا ئێستا کەس نەیبینیوە، موفتیش بەیەکێك دەڵێت: کتێبەکە بگرە بە دەستەوە بزانە هەمووم لەبەرە یان نا، لە سەرەوە دەست دەکات بە خوێندنەوەی تا دە (١٠) پەڕە، ئینجا دەڵێت لە ناوەڕاستیشەوە لە فیسارە شوێنەوە بیکەرەوە، دەست دەکات بە خوێندنەوەی تا دە (١٠) پەڕە، لە پاشا لە دواییەکەشیەوە دە (١٠) پەڕەی دەخوێنێتەوە تا تەواوی دەکات، ئینجا ئاخوند سەر دادەخات و ئارەقێکی شەرم دەڕێژێت و دەڕوات، ئیتر بڕای بە بڕای جارێکی تر سەر بکاتەوە بە بەغدادا.

# نموونەیەك لە پێگەیشتووانی بەردەستی

موفتی وەك لە پێشەوە وتمان، هەشتا ساڵ لەسەریەك تەدریسی كردووە، ئەمین زەكی بەگ لە كتێبی (تاریخی سلێمانی وە وڵاتی)[1]دا دەڵێت: لە شەش هەزار كەس زیاتر لە خزمەتیا خوێندوویەتی[2]، لە دەریای زانایی ئەو لەوێچیان[3] لێ گرتووە، لە سەرچاوەی دانایی ئەو تێریان لێ خواردووەتەوە.

نموونەیەك لە پێگەیشتووەكانی بەردەستی: مەلا قادری شێخەڵمارێنی، مودەڕڕیسی مەدرەسەی سلێمانی لە بەغداد. مەلا حوسەینی پشدەری مودەڕڕیسی مەدرەسەی ئیمام ئەعزەم و شاریحی (تشریح الأفلاك)ی (بهاءالدینی عاملیی). شێخ عبدالرحمانی قەرەداغی[4] و مەلا عەبدوڵڵای پیرەباب و مەلا عەلی قزڵجی[1] و مەلا

---

(١) محمد أمین زكی، تاریخی سلێمانی وە وڵاتی. (ل١٨٣). (ئامادەكار)

(٢) ئەمە بۆ پێشەوایەكی بەناوبانگی وەك موفتی زەهاوی دوور نیە، چونكە ئەم جۆرە ناودارانە لە هەموو لایەكەوە خوێندەواران خۆیانی بۆ دەكوتن، كە بۆ بەهرەمەندیی، یان بۆ ناونیشان لە لایان بخوێنن و هەمیشە كۆڕی دەرسیان لە بیست فەقێ كەمتر نەبووە.

(٣) لەوێچ: قووڵیی تەنها دەستێك كە پەنجەكانی پێكەوە بنوسێنرێت، بەنموونە دەوترێت: (پڕ لەوێچێك مێووژم بدەرێ). (فەرهەنگی خاڵ/ ل٥٤١). (ئامادەكار)

(٤) ئەم زانایە لە ساڵی (١٢٥٣ك) لەدایكبووە، لە ساڵی (١٣٣٥ك) لە بەغداد كۆچی دوایی كردووە، لە تەكیەی (بابا گوڕ گوڕ) نێژراوە.

ئەم زانایە پازدە (١٥) تەئلیفی زۆر بەرزی هەیە:

١- (دقائق الحقائق) لە نەحودا.

٢- (فهم الوصول شرح منهاج الأصول) لە ئوصولی فیقهدا.

٣- (التحقیق العالي شرح قصیدة الأمالي).

٤- (ملخص الأقوال في خلق الأعمال).

٥- (أسنی المطالب في علم الواجب) لە كەلامدا.

**محەمەدی کەوانەدۆڵی و شێخ حەسەنی قەرەداغی مودەڕڕیسی کفری و شێخ عەبدوڵڵای کوڕی شێخ حەسەنی قەرەداغی شاریحی (زەوڕا و حەوڕا) لە عیملی کەلامدا و مەلا عیسای هەرتەلی و مەلا ئەحمەدی کوڕی مەلا محەمەدی جامی کۆیی و سەید عبدالرحمانی نەقیبی بەغداد و شێخ عبدالوەهابی نائیب[٢] و حاجی مەلا**

---

٦ـ (تحفة اللبيب) لە مەنتيقدا.

٧ـ (مواهب الرحمن) لە بەیاندا.

٨ـ (الإيقاظ) لە وەزعدا.

٩ـ (فتاوى) لە فیقهدا.

١٠ـ (الأجوبة البهية في جواب الأسئلة الهندية).

١١ـ (تنبيه الأصدقاء في بيان التقليد والاجتهاد والإفتاء والاستفتاء).

١٢ـ حاشیەی بەسەر تەفسیری (بیضاوي)یەوە.

١٣ـ حاشیەی بەسەر توحفەی ئیبنو حەجەرەوە.

١٤ـ حاشیەی بەسەر شەرحی موختەصەری مونتەهاوە.

١٥ـ حاشیەی بەسەر عبدالحکیمی سیالەکوتی لە مەنتیقدا.

(ئەم پازدە (١٥) دانراوەی کە مامۆستای خاڵ باسی کردووە، بەشێکە لە دانراوەکانی شێخ عبدالرحمانی قەرەداغی، نەك هەموو دانراوەکانی بێت وەك لە قسەکەی مامۆستای خاڵ دەردەکەوێت، بەڵکو ئەم زانایە کۆمەڵێك دانراوی تریشی هەیە کە لێرەدا باس نەکراوە. بڕوانە : طاهر البحركي، حياة الأمجاد من العلماء الأكراد. (ب٢/ ل٦٦و٦٧). (ئامادەکار).)

(١) ئەم زانایە لە ساڵی (١٢٩٥)ك دا کۆچی دوایی کردووە. دەگێڕنەوە کە هەموو جارێك موفتی فەرموویەتی: ئەگەر زیرەکی مەلا عەبدوڵڵای پیرەباب و کۆششی مەلا عەلی قزڵجی لە یەکێکدا کۆببێتەوە منی لێ پەیدا دەبێت.

(٢) ئەم زانایە تەئلیفێکی چاپکراوی هەیە ناوی (هداية الوصول لبيان الفرق بين النبي والرسول)ە، موفتی تەقریزێکی زۆر جوانی کردووە.

(هەر لەم کتێبەدا، لە باسی (نەسر–پەخشان)ی موفتی زەهاوییدا، لە پەراوێزێکدا ئەم پێشەکی بەباڵابڕینە (تەقریزە)ی موفتیمان نوسیوەتەوە. (ئامادەکار).)

ئەحمەدی دێلێژەیی[1] و مەلا ئەحمەدی کوێر[2] و مەلا عەبدوڵڵای شاریی و مەلا عەلی کوڕی ئەحمەدی کۆرەیی جوانڕۆیی و شێخ موستەفای کوڕی شێخ عەلی بابارەسوڵ موفتی سلێمانی[3] و مەلا ڕەزای کەرکوکی و مەلا عەلی حیکمەت ئەفەندی و مەلا محەمەدی مەحوی[4] بووە، کە ساڵەهای ساڵ خۆشەچینی خەرمەنی زانین و کاسەلێسی خوانی عیلمی موفتی بوون.

---

(١) ئەم دانایە لە ساڵی (١٢٥٢ك) لەدایکبووە و لە ساڵی (١٣١٨ك) لە سلێمانی مردووە، دوو ریسالەی جوانی هەیە لە عیملی کەلامدا، هەردووکیان لە سلێمانی لە ساڵی (١٣٥٤ك) چاپ کراوون.

(٢) ئەم مەلا ئەحمەدە خەڵکی دێی (عومەر گومبەدە)یە، لە ساڵی (١٢٤٥ك) لەدایکبووە و لە ساڵی (١٣٣٥ك) لە دێی ناوبراو مردووە.

(٣) ئەم زانایە لە ساڵی (١٢٣٤ك) لە سلێمانی لەدایکبووە.

(٤) ئەم دانایە لە دێی (باڵخ) لە لیوای سلێمانی، لە ساڵی (١٢٥٢ك) لەدایکبووە و لە ساڵی (١٣٢٧ك) لە سلێمانی مردووە. زۆر زانا و شاعیرێکی ورد بووە، بە زبانی کوردی و فارسی و تورکی و عەرەبی شیعری وتووە، دیوانێکی کوردی هەیە لە سلێمانی لە ساڵی (١٣٤١ك–١٩٢٢ز) لەچاپدراوە.

# مەزهەبی تازە و کۆنی

زەهاوی کوردێکی سوننی و شافیعیی مەزهەب بووە، بەڵام لە پاش ئەمەی کە بووە بە موفتی بەغداد و ئەهلی ئەو ناوچەیەش هەموو حەنەفی بوون و فتوایشی پێویست بووە هەر بە حەنەفی بێت، بەتایبەتی خەلیفەی ئیسلامیش حەنەفی بووە، ئەمیش بووە بە حەنەفی.[1]

---

(١) بوونی موفتی بە حەنەفی بەلای هێندێك لە زانایانی کوردەوە ناپەسەند بووە، تەنانەت لە (مەلا حوسەینی پیسکەندی)م بیست فەرموی: کاتێك کە موفتی مرد، فەقێ بووم لەلای مەلا عبدالرحمانی پێنجوێنی، کە خەبەرەکەیان هێنا ئێمە هەموو خەفەتبار بووین، بەڵام (مەلا) هیچ پێی ناخۆش نەبوو، ئێمەش لێمان پرسی؟ فەرمووی: یەکێك کە شافیعی بووبێت و بۆ پایەی دونیا بووبێت بە حەنەفی من چۆن خەفەت بۆ مردنی بخۆم؟

من بەشبەحاڵی خۆم ئەمە بە تەعەصوبێکی وشك و برنگ دەزانم، کە پێویستە هەموو تێگەیشتوویەك خۆی لێ بپارێزێت، چونکە دەگونجێت موفتی مەزهەبی حەنەفی پێ باشتر بووبێت لە مەزهەبی شافیعی.

زۆر سەیرە ! ئیمامی شافیعی ـ خوا لێی خۆش بێت ـ کە خەڵکی شاری (غەززە)یە لە فەلەستین و ژیینی هەر لە عەرەبستانا بووە و مەرقەدی لە قاهیرەیە، زۆر دوورە لە کوردستانەوە، کەچی مەزهەبەکەی بڵاو بۆتەوە بەناو هەموو کونو قوژبنی کوردەواریدا !

ئیمامی ئەعزەمیش کە باوك و باپیری ئێرانین و خۆشی لە عێراقدا لەدایکبووە و مەرقەدی لە بەغدادە — کە بە بن چنگی کوردستانەوەیە— جگە لەوە کە مەزهەبەکەیشی گەلێ لە مەزهەبی شافیعی ئاسانترە، شارستانی ترە، کەچی نەکەوتووەتە کوردەوارییەوە !

(التعریف) لە وەڵامی ئەم پرسیارەدا دەڵێت: لە خەلافەتی عەبباسیدا عولەما و زانایانی حەنەفی هەموو لەسەر کورسی بەرز، خاوەنی پیشە و پایەی گەورە بوون، وەك (أبو یوسف) و (محمد بن الحسن)، کە هەردووکیان بەرودوا (قاضي القضاة) بوون لە بەغدادا، بەم بۆنەیەوە لە تەدریس دوورکەوتوونەتەوە، هەمیشە لەگەڵ خەلیفە و وەزیران و پیاوی گەورەی دەوڵەتابوون، مەزهەبی حەنەفی یان لە ناویانا بڵاوکردووەتەوە، بۆیە لەو ڕۆژەوە ئەم مەزهەبە هەمیشە مەزهەبێکی ڕەسمی حکومەتیی بووە، چ لە خەلافەتی عوسمانیدا و چ لە حکومەتی ئێستای عێراقدا.

# شێوه و هێندێ له سروشتی

موفتی –وەك لە شێخی باپیرم بیستووه– پیاوێکی باڵابەرزی سوروسپی چوارشانەی توکنی داڕێژراوی بەخۆوه بووه، سەرێکی گەوره و دوو چاوی ڕەشی پانی تیژی بریسکەداری بەسامی بووه، پڕ بەچاو تەماشای هەرکەسێکی کردبێت شڵەژاوه و چاوی داخستووه، دەنگی دلێر و نێر و بەرز بووه.

موفتی زۆر بەرچاو تێر بووه، هەرگیز پارەی کۆنەکردووەتەوه، حەزی لە کاڵای جوان و خواردنی خۆش کردووه، هەرچییەکی بووه لە میوانداریدا بەختی کردووه، نەخوازەڵڵا ئەو کوردە بێ نەوایانەی کە پەنایان بۆ بردووه، لە دیوەخانەکەیدا ماونەتەوه تا بە مەبەست و ئاواتی خۆیانی گەیاندوون.

موفتی دوگمەی سوخمەی کەمتر داخستووه، لەبەر ئەمە زۆر جار موی سەرسنگی دەرکەوتووه، تەنانەت جارێکیان لە مەجلیسی ئیدارە، لەبەردەمی والیدا یەکێك لە ئەندامەکان کە نەقیبی بەغداد دەبێت، ئەمەی بە نەنگ لێ دەگرێت، موفتیش خێرا یەخەی دەهێنێتەوه یەك و بە تەوسەوه[1] دەڵێت: من عەیبەکەی خۆم داپۆشی، ئێوەش ئەگەر ئازان عەیبی خۆتان داپۆشن!

---

بەڵام شافیعیەکان لەبەر ئەمەی کە ئەو پایە و شوێنانەیان دەستنەکەوتووه لە حکومەتدا، ناچار دەستیان کردووه بە تەدریس و بڵاوکردنەوەی مەزهەبی شافیعی.

جگە لەوه کە مەدرەسەی (نیزامییە)ش –کە گەورەترین مەدرەسەیەك بووه لەو ڕۆژەدا لە بەغدادا– بەدەست زانایانی شافیعییەوه بووه، کوردەکان لە هەموو لایەکەوه ڕوویان تێکردووه، فیقهو ئوصولی شافیعیان تیا خوێندووه، لە پاشا کە گەڕاونەتەوه کوردستان مەزهەبی شافیعیان تیا بڵاوکردووەتەوه.

(١) تەوس: پلارهاویشتن لە گفتوگۆدا بۆ یەکێك، بە ڕەنگێك کە هەموو کەس تێنەگات. (فەرهەنگی خاڵ/ ل١٤٠).(ئامادەکار)

موفتی به گەنجی زۆر حەزی لە شەڕەکەڵەشێر کردووە، هەمیشە کەڵەشێری دووڕەگ[1] و کرماشانی ڕاگرتووە، تەنانەت لە باپیرم بیستووە دەیفەرموو: جارێکیان بە منالّی لە شەڕە کەڵەشێر دەگەڕێتەوە، کەڵەشێرەکە لە ژێر لەبادەکەیا[2] دەبێت، کتوپڕ باوکی بانگی دەکات بۆ دەرس خوێندن، ئەمیش ناگات کەڵەشێرەکە دابنێت، ناچار دەست ئەداتە کتێبەکەی و دەست دەکات بە دەرس خوێندن، تا لێ دەبێتەوە نایەڵێت باوکی پێی بزانێت.

---

(١) دووڕەگ: گیاندارێکە کە باوك و دایکی لە جۆرێك نەبن. (فەرهەنگی خاڵ/ ل٢٤٣).(ئامادەکار)

(٢) لەبادە– لبادە: جۆرە کاڵایەکی قۆڵداری ناوداری پڕتەرییە لەسەر کاڵای ترەوە لەبەر دەکرێت. (فەرهەنگی خاڵ/ ل٥٢٨).(ئامادەکار)

# مسوڵمانیەتی و خواناسینی موفتی

موفتی پیاوێکی زۆر خواشناس و لە خواترس بووە و هەمیشە دڵی لەگەڵ خوای خۆیا پەیوەست بووە، خۆی لە ژێر چاودێری ئەوا بینیوە، لەبەر ئەمە هەرگیز زیانی بۆ کەس نەبووە، ناوی کەسی بە خراپە نەبردووە، بەڵکو ناوی هەموو کەسێکی هەر بە چاکە بردووە، تا توانیبێتی یارمەتی و دەستگیرۆیی هەموو کەسێکی کردووە بەبێ جیاوازی، نەخوازەڵڵا مەلا و خوێندەواران، هەموو جارێك پێش خۆی خستون و بردونی بۆ لای والی، گەلێ گەلێ لە خۆی بە مەلاتر و خوێندەوارتر پیشان داون.

موفتی وێڵ و پابەندیماڵی دونیا نەبووە، تەنانەت دەگێڕنەوە کە والی مەدحەت پاشا زۆر تکای لێ کردووە کە موقاتەعەی (بەلەدروز)[1]ی بداتێ بە پارەیەکی زۆر کەم، مانگە و مانگ شتێکی زۆر کەم بدات بە حکومەت، بەڵام موفتی قبوڵی نەکردووە، فەرمویەتی: نامەوێت، نەوەك زۆر دەوڵەمەند ببم و لەدوای خۆم منداڵەکانم یاخی ببن، ڕوو لە خوا وەربگێڕن.

موفتی لە شیعرەکانیەوە دەردەکەوێت کە موسڵمانێکی زۆر ڕاست بووە، هەر خوای ناسیوە، خوا ئەیزانێت ئەم تاقە شیعرەی کە دەڵێت:

**لا تدع في حاجة بازا ولا أسدا**

**الله ربك لا تشـــرك به أحـدا**[2]

جگە لەوەی دیوانێکی شیعر دەهێنێ، ئیمانی مرۆڤ تازە و بەهێز دەکاتەوە و فێری خوا ناسینی دەکات.

---

(١) بەلەدروز: شارێکی عێراقیە، ناوەندی قەزایەکە، سەر بە پارێزگای دیالەیە. (ئامادەکار)

(٢) مانای ئەم شیعرە لە باسی (شیعری سکاڵا و پەندی)دا نووسراوە.

# قەناعەتی

موفتی لە سەرەتای مەلایەتیدا لە سلێمانی زۆر دەست کورت بووە، لەگەڵ ئەو نەبوونیەشدا دڵفراوان بووە و هەرگیز تەدریسی پەکنەخستووە.

تەنانەت دەگێڕنەوە: کە ڕۆژێك لە کاتی دەرس وتنەوەدا زۆر بێ هەوەس دەبێت، یەکێك لە فەقێکانی لێی دەپرسێت کە بۆ چ وا بێ کەیفی؟ ئەویش کتوپڕ بەم شیعرە عەرەبییەی وەڵامی دەداتەوە، دەڵێت:

**جعلتُ قولي شرحا لحالي**

**فاحذف اللام تفهم سؤالي**

یەعنی: (جعلتُ)م کرد بە شەرحی حاڵی خۆم، ئەو لامەی کە تیایەتی فڕێیدە، ئیتر وەڵامیت دەست دەکەوێت، چونکە (جعتُ)ی دەمێنێتەوە، واتە برسیمە بۆیە بێ هەوەسم.

دووبارە دەگێڕنەوە: کە شێخ موستەفای موفتی کوڕی شێخ عەلی بابە ڕەسوڵی گەورە، هەموو ڕۆژێك لای زەهاوی دەرسی خوێندووە، ڕۆژێك موفتی بەبێ کەیفی دەبینێت، لێی دەپرسێت بۆچی وا بێ کەیفی؟ ئەویش دەڵێت: ئەمە چەند ڕۆژە زاد لەماڵمانا نیە، لە ئێوارەیشەوە خێزانم مناڵی بووە، نە پارچە پەڕۆیەك هەیە لە مناڵەکەیەوە بپێچین و نە لەوێچێ ئاردمان هەیە بۆ دایکی بکەین بە قەیماغ[1]. شێخ موستەفا دەچێتەوە ماڵەوە بۆ دایکی دەگێڕێتەوە، دایکی دەڵێت: چوار گەز چۆغە شك دەبەم –کە وەختی خۆی باوکت لە ئەستەمبوڵ هێناویەتی– بۆی ببە، ئەمیش بۆی دەبات و بە زۆر دەیبڕێت بەسەریا، موفتیش دەیفرۆشێت و چی پێویست بێت بۆ خۆی و ماڵ و مناڵی پێی دەکڕێت.

---

(١) قەیماغ: جۆرە خواردنێکی شلە لە ئارد و ڕۆن دروست دەکرێت، دەبێتە پەڵوڵەیەکی چەور، دەدرێت بە ئافرەتی زەیستان. (فەرهەنگی خاڵ/ ل٩٩و٤٣١). (ئامادەکار)

# وەفاداری

موفتی تا بڵێی پیاوێکی مەرد و بە وەفا بووە، هەرکەسێك چاکەیەکی لەگەڵدا کردبێت هەرگیز فەرامۆشی نەکردووە، لە هەر کاتێکدا بۆی هەڵکەوتبێت پاداشتی داوەتەوە و چاکەی لەگەڵ خزم و خوێشیشیا کردووە.

تەنانەت دەگێڕنەوە: کە عومەر بەگی کوڕی مەحمود بەگ –کە برازای ئەحمەد بەگی موسلیم بووە کە وەختێ موفتی مودەڕڕیسی مەدرەسەی ئەو بووە لە کەرکوك– بەهۆی دەستبڵاوی خۆیەوە هەرچییەکی بووە لە دارایی بەرەبەرە هەمووی لەناوبردووە، لە پاشا نەدارا کەوتووە، ناچار چووە بۆ بەغداد بۆ لای موفتی زەهاوی، کە دەیناسێتەوە زۆر ئیحترامی دەگرێت، لە پاشا عومەر بەگ بەسەرهاتی خۆی بۆ دەگێڕێتەوە و تکای لێ دەکات کە بە شتێك دایمەزرێنێت، موفتی بەیانی لەگەڵ خۆی دەیبات بۆ لای والی، لەوێ دێت بە باسی ئەحمەد بەگ و برا و برازایا و تکای بۆ عومەر بەگ لێ دەکات، والیش هەر لەوێ عومەر بەگ دەکات بە قایمقام.

دووبارە دەگێڕنەوە: لە خەڵکی سلێمانی صاڵحی تەها، چاوەشی[1] فەرمانبەری موشیری بەغداد (هیدایەت پاشا) بووە، شەوێ موفتی لە ماڵی موشیر داوای ئاو دەکات، کاك صاڵح ئاوەکەی بۆ دەبات، موفتی بۆ ئەوەی کە کوردێکی هاوشاریی خۆی بە بەهرە بگەیەنێت، کە سەر هەڵدەبڕێ دەڵێت: ئای صاڵح ئاغا ئەمە تۆ ئاوەکەت هێنا؟ بەخوا نایخۆمەوە و ئاوەکەی لێ وەرناگرێت، لە پاشا بە موشیر

---

(١) چاوەش: شایەر و دەهۆڵ و زوڕناژەن. کەسێکە لە پایەی سەربازیدا بیست سەربازی بەدەست بێت. (فەرهەنگی خاڵ/ ل١٦٨). (ئامادەکار)

دەڵێت: ئەمە یەکێکە لە خانەوادەکانی سلێمانی و من حەقی باوکی ئەمەم زۆر بەسەرەوەیە، ئیتر موشیر هەر بە ئاغا ئاغا کاك صاڵح بانگ دەکات و ئەیشی کات بە مودیری داخلی ماڵی خۆی مانگی بە (١٢) لیرە، هەرچی هەست و نیستیشی هەیە دەیداتە دەستی، ئینجا هەموو جارێك صاڵح ئاغا گێڕاویەتیەوە و وتوویەتی: ئەم ئاغایەتیەم لەو شەوەوە دەست کەوت، لەگەڵ ئەمیشە کە باوەڕناکەم موفتی سێبەری ماڵی ئێمەی کەوتبێتە سەر، نانێکی باوکی منی کەل کردبێت.

# پاڵەوانیی موفتی

موفتی بە گەنجی زۆرخانەی[1] کردووە، لەبەر ئەمە تا بڵێیت چوست و چالاك و بەهێز و توانا و خاوەنی دەست و بازویەکی پاڵەوانانە بووە.

تەنانەت دەگێڕنەوە: لە قەڵای جوانڕۆ مەدرەسەی مەلا عیسای کلاشی هەمیشە پڕ بووە لە فەقێی چاك، ئەم فەقێیانە هەموو ڕۆژی سێشەممە و هەینییەك لە قەراغ شار یاری (شەڕەتۆپ)یان کردووە، هەموو جارێك کوڕە جولەکەیەك تێکەڵی یارییەکەیان دەبێت و بە تۆپ شپرزەیان دەکات، یان دەستی فەقێیەکی لەجێ بردووە، یان پەراسویەکی شکاندووە، یان پێیەکی لە خرتکە بردووە، فەقێکان تەنگیان پێ هەڵدەچنرێت، بەڵام ڕووشیان نایەت کە دەست لە یاریەکە هەڵگرن، یان جووە دەرکەن، ناچار هەموو جارێك یارییەکە دەکەن، وەلێ زۆر بە ترس و لەرز و پارێزەوە. ئەم دەنگوباسە دەگات بە زەهاوی —کە لەو کاتەدا فەقێ دەبێت— غیرەتی فەقێیەتی و گەنجی و خوێنگەرمی دەیهێنێتە جونبوش و جوڵە جوڵ، یەك دوو کتێبێك هەڵدەگرێت و خۆت بگرە قەڵای جوانڕۆ! وا هاتم، کە دەگاتە ئەوێ، ئەو شەوە ماندوویی دەحەسێتەوە، بەیانی سێشەممە دەبێت لەگەڵ فەقێکانا دەچێت بۆ یاریی، کە دەست بە شەڕە تۆپ دەکەن، لەو میانەدا کوڕە جولەکەکە دەناسێتەوە، تۆپێکی تێدەگرێت گێڕی دەکات، جووە دەڵێت: فەقێی تازە قەڵڵا[2] وازم لێ بێنە با ناڵت نەکەم! ئەمیش دەڵێت: چیت لەدەست دێت درێغ مەکە، جووە بە قیینەوە تۆپێکی تێ دەگرێت، بەڵام ئەم دەیقۆزێتەوە، لەگەڵ ئەیگرێتە جووە لنگەو قوچ دەیخات، جووە هەڵدەسێتەوە دووبارە تۆپێکی تر دەگرێتەوە موفتی، بەڵام بۆ کوشتنی،

---

(١) زۆرخانە: جیگایەکی تایبەتیە، هێندێ جۆرە یاری تێدا دەکرێ بۆ بەهێزبوونی ئەندام و جەستە. (فەرهەنگی خاڵ/ل٢٩٨). (ئامادەکار)

(٢) تازە قەڵڵا: شتی تازە داهاتوو. (فەرهەنگی خاڵ/ ل١١٤). (ئامادەکار)

دیسان وەك پڵنگ دەیگرێتەوە، لەگەڵ دەیگرێتەوە جووە، نیوە مردووی دەكات، جووە دەچێت بەگژ موفتی دا، ئەمیش نایكاتە نامەردیی، دەستی دەخاتە ژێر بۆقەتەی[1] ملی و دەستەكەی تری دەخاتە ژێر سمت و هەردوو قاچی، لەگەڵ هەردوو دەستی خۆی ئەدا بەیەكدا، سەرو قنگی دەكات بەیەك.

موفتی دەستڕاست و نیشانشكێن بووە، تەنانەت دەگێڕنەوە: ئەو هاوینەی كە لە دێی خەرپانی لە خزمەت شێخ عەبدوڵلادا خوێندوویەتی، ئێواران لەناو باخدا پەلەپیتكەی گرتووەتە هێشووە تریێ بە دالێتی[2] زۆر بەرزەوە و هەموو پەلەپیتكەیەكی داوە لە بنكی هێشووە ترێییەك و خستوویەتیە خوارەوە و گرتوویەتیەوە.

## خێزان و مندالانی

موفتی دوو خێزان و دوو كەنیزەكی بووە، خێزانەكانی یەكێكیان ناوی (گوڵناز) و خەڵكی سلێمانی بووە، ئەویتریان ناوی (پیرۆز) و خەڵكی كۆیە بووە، كەنیزەكەكانی یەكێكیان ناوی (ڕەیحان) ئەوی تریان ناوی (ڕەندێ) بووە.

لە گوڵناز پێنج كوڕ و كچێكی بووە: عەبدوڵلا، عبدالحكيم، ڕەشید، عبداللطيف، سەعید، حەلیمە. لە پیرۆزیش چوار كوڕ و كچێكی بووە: صاڵح، عبدالغني، جەمیل صیدقی، عبدالجليل، عاسیمە. لە ڕەیحان كوڕێكی بووە: سەلیم. لە ڕەندێ سێ كوڕ و كچێكی بووە: عەلی، مەحمود، عبدالحميد، ئامینە.

---

(١) بۆقەتە: پشتی مل. (فەرهەنگی خاڵ/ ل٤٦). (ئامادەكار)

(٢) دالێت: میوەیەكە كە چوبێت بەقەد درەختێكدا. (فەرهەنگی خاڵ/ ل٢٢٩). (ئامادەكار)

کوڕانی موفتی بەرودوا بەم ڕەنگە لەدایکبوون: عەبدوڵڵا[(١)]، عبدالحکیم[(٢)]، عەلی[(٣)]، مەحمود[(٤)]، محەمەد ڕەشید[(٥)] محەمەد صالّح[(٦)]، عبداللطیف[(٧)]، محەمەد سەعید[(٨)]، عبدالحمید[(٩)]، محەمەد سەلیم[(١٠)]،

---

(١) لە ساڵی (١٢٤٧ك) لە سلێمانی لەدایکبووە، بە گەنجی بە نەخۆشی ئاوبەند مردووە.

(٢) لە ١٥ی شەوالی (١٢٥٧ك) لە کەرکوك لەدایکبووە، لە پاشا بووە بە (ضابط) و بە موڕافیقی (مەدحەت پاشا)ی والی بەغداد، لە پاشا بەرەبەرە سەرکەوتووە تا بووە بە (عەقید) و لە ساڵی (١٣٣٦ك)دا مردووە.

(٣) لە ١٥ ڕەمەزانی (١٢٦٠ك) لە بەغداد لەدایکبووە و هەر لەوێ مردووە.

(٤) لە ٢٩ی (ذي القعدة)ی (١٢٦٢ك) لە بەغداد لەدایکبووە، لە پاشا بووە بە بیین باشی ڕەدیف، لە بەسرە مردووە.

(٥) لە ٢٠ی صەفەری (١٢٦٤ك) لە بەغداد لەدایکبووە، زۆر دانا و لە هێندێ قەزای عێراق و سوریادا قائیمقام بووە، چەن دەمێکیش لە بەغداد ئەندامی مەحکەمەی ئیستیئناف و لە کەربەلا وەکیلی موتەسەڕڕیف بووە، لە ساڵی (١٣٢٧)ی ڕۆمیدا مردووە.

(ساڵی ڕۆمی ساڵنامەیەکە لە سەردەمی عوسمانیەکاندا بەکارهاتووە، ناسراو بووە بە ساڵنامەی ڕۆمی یان مالی.ساڵی (١٣٢٧) ڕۆمی کە ساڵی کۆچی دوایی محەمەد ڕەشید زەهاوییە هاوکاتە لەگەڵ (١٩١١ز) و (١٣٢٩ك). (ئامادەکار).)

(٦) لە ١٥ی (ذي القعدة)ی (١٢٦٥ك) لە بەغداد لەدایکبووە، خوێندەوارێکی بەرز و زانایەکی ئاینیی بووە، هەر لە بەغداد مردووە.

(٧) لە ١٨ی (ربیع الأول)ی (١٢٦٦ك) لە بەغداد لەدایکبووە، چەند ساڵێکی زۆر قایمقامی کازمیە و مەندەلی و کووت بووە، لە بەغداد مردووە.

(٨) لە ١٢ی ڕەجەبی (١٢٦٨ك) لە بەغداد لەدایکبووە، لەدوای مردنی باوکی بووە بە موفتی بەغداد و لە پایەی عیلمیدا پایەی (حەرەمەین)ی بووە، لە پاش نەمانی دەوڵەتی تورك، لە بەغداد بووە بە مودیری ئەوقافی عام، لە ساڵی (١٩٢١ز) لە بەغداد مردووە.

(٩) لە ١٣ی شەعبانی (١٢٧١ك) لە بەغداد لەدایکبووە، لە پاشا بووە بە یوزباشیی، لە هەرایەکی ئەهلی دا کوژراوە.

(١٠) لە ٢٢ی (جمادی الأولی) (١٢٧٤ك) لە بەغداد لەدایکبووە، لە پاشا بووە بە مودیری ناحیە، لە بەغداد مردووە.

عبدالغني[1]، جەمیل صیدقی[2]، عبـدالجلیل[3].

(١) لە ٢٥ی شەوالی (١٢٧٧ك) لە بەغداد لەدایكبووە، زۆر شاعیر بووە، نەخوازەللّا لە فارسی دا، تەنانەت جەمیل صیدقی وتوویەتی: كاكم لە من شاعیرترە لە فارسی دا، لە ساڵی (١٣٢٣)ی ڕۆمیدا لە بەغداد مردووە.

(ساڵی (١٣٢٣) ڕۆمی هاوكاتە لەگەڵ (١٩٠٧ز) و (١٣٢٥ك). (ئامادەكار).)

(٢) لە ٢٩ی (ذو الحجة)ی (١٢٧٩ك) ڕێكەوتی (١٨٦٣/٦/١٨ز) لە بەغداد لەدایكبووە، لە ٢ی تەموزی (١٣٠٣)ی ڕۆمیدا كراوە بە ئەندامی مەجلیسی مەعاریفی لیوای بەغداد و لە دوای سێ (٣) ساڵ بووە بە مودیری چاپخانەی ویلایەت و موحەرریری ڕۆژنامەی (زەوراء)ی ڕەسمی،لە ساڵی (١٣٠٨) بووە بە ئەندامی مەحكەمەی ئیستیئناف، لە ساڵی (١٨٩٦ز)دا لە ئەستەمبوڵەوە بانگ كرا، لەگەڵ بیعسەی ئیسلاحاتدا نێردرا بۆ یەمەن، لە پاش ساڵێك گەڕایەوە، نیشان و ڕوتبەی (بیلادی خەمسە)ی درایە، لە دوای ئیعلانی مەشڕوتیەتی عوسمانی كرا بە نائیبی بەغداد و چووەوە بۆ ئەستەنبوڵ، لە داوی جەنگی گەورەی یەكەم گەڕایەوە بۆ بەغداد، لە ساڵی (١٩٢٥ز) كە تەشكیلی حكومەتی عێراق و ئیعلانی دەستور كرا، بوو بە ئەندامی مەجلیسی ئەعیان، لە ساڵی (١٩٣٥ز)دا لە بەغداد مردووە.

جەمیل صیدقی لە زمانی عەرەبی و فارسی و توركی و كوردیدا شاعیرێكی بڵند و یەكتا بووە، قسەی نەستەق و بەرزی زۆرە، پازدە تەئلیفی زۆر جوان و بەنرخی هەیە كە ئەمین زەكی بەگ لە (تاریخی سلیمانی وە وڵاتی/ل١٨٤و١٨٥) دا یەك بەیەك ناوی نوسیون.

(ساڵی (١٣٠٣)ی ڕۆمی هاوكاتە لەگەڵ (١٨٨٧ز) و (١٣٠٤ك).

ساڵی (١٣٠٨)ی ڕۆمی هاوكاتە لەگەڵ (١٨٩٢ز) و (١٣٠٩ك). (ئامادەكار).)

(٣)لە ١٥ی (جمادی الآخرة)ی (١٢٨٤ك) لە بەغداد لەدایكبووە، خاوەن زەوی و زار بووە و بە كشتوكاڵەوە خەریك بووە، لە بەغداد مردووە.

# قسەی نەستەق و بە تویکڵی

موفتی زۆر قسەزان و قسەنەستەق و قسەخۆش و نوکتەباز بووە، لەسەر هیچ قسەیەك دانەماوە،گەلێ قسەی بەتوێکڵی جوانی هەیە کە شایستەن بە ئاوی تەلا بنوسرێنەوە.

دەگێڕنەوە: کە جارێك (داود پاشا) ناوێك بە گاڵتەوە لە موفتی پرسیوە کە بۆچی لە مزگەوت و مەدرەسەکانی ئێوەدا میسالتان لە عیلمی نەحودا هەر (ضَربَ زیدٌ عمراً)ە؟ هەمیشە بە زەیدی زۆردار لە عەمری هەژار دەدەن، عەمر دەبێت چ سووچ و گوناهێکی ببێت؟ موفتیش کتوپڕ دەڵێت: پاشا چونکی دزە، نابینن (واو)ێکی لە ناوی ئێوە دزیوە؟[1] داود پاشا قسەکەی زۆر پێ جوان دەبێت و ئێجگار لای خۆش دەبێت.

دووبارە دەگێڕنەوە: کە جارێکیان موفتی باسی شاعیری بەناوبانگ (بێ دڵ) دەکات و تەعریفی شیعری دەکات، چەند شاعیرێکی بەغدادیی لێی دەپرسن بێ دڵ مەعنای چیە؟ موفتیش دەڵێت: (عدیم القلب)، ئەوانیش دەڵێن: یەکێك کە دڵی نەبێت دەبێت شیعرەکانی چی بێت؟ موفتیش دەڵێت: (لا یعرف عدیم القلب إلا من له قلب أو ألقی السمع وهو شهید)، یەعنی: مەعنای شیعری بێ دڵ نازانێ ژیرێکی خاوەن دڵ، یان گوێگرێکی تێگەیشتوو نەبێت.

دیسان دەگێڕنەوە: کە جارێك لای موفتی باسی قسەخۆشیی حاجی مەلا عەبدوڵڵای کۆیە دەکرێت، موفتیش دەڵێت: گوێم بۆ قسەخۆشەکانی کاکە عەبدوڵڵا خێل بووە.

هەمدیسان دەگێڕنەوە: کە ڕۆژێ موفتی لەماڵەوە نێرگەلە دەکێشێت، ئیبراهیمی کوڕەزای منالێ دەبێت لە نێرگەلەکە دەکەوێت و بەسەریا دەڕژێت، موفتیش کتوپڕ

---

(١) یەعنی (داود) کە دەبێت بە دوو (واو) بنوسرێت، کەچی ئێستا بە یەك (واو) دەنوسرێت، (عمرو) کە (واو)ی نیە، کەچی (واو) ێکی لە دواوە بۆ دەنوسرێت، بۆ ئەوەی لە خوێندنەوەدا لە (عُمَر) جیاببێتەوە، جا بەم بۆنەیەوە گوایە (عمرو) ئەو (و)ەی لە (داود) دزییوە.

ڕاست دەبێتەوە و پەلاماری منالەکە دەدات و دەڵێت: (يَا نَارُ كُونِي بَرْدًا وَسَلَآمًا عَلَى إِبْرَاهِيمَ) (الأنبياء: ٦٩)[1]، واتە: ئاگرەکە سارد بەرەوە و ئیبراهیم مەسوتێنە.

هەروەها دەگێڕنەوە: کە ڕۆژێك لە دەمی نیوەڕۆدا موفتی دەچێت بۆ لای والی، والیش بانگ دەکاتە قاوەچیەکەی، دەڵێت (جیب قهوه) واتە: قاوە بێنە، موفتیش تومەز برسیەتی و ئارەزوی قاوەڵتی دەبێت، نەك قاوە، دەڵێت: (بدلها بالتي هي أحسن) یەعنی: قەهوەکە بگۆڕە بە شتێکی باشتری خۆشتر کە (قهوالتی)یە، یان (هـائـ)ی ئاخیری (قهوه) بکە بە (التی) ئەو کاتە دەبێت بە قەهواڵتی.

زۆر جار موفتی لەگەڵ ماڵ و منالی خۆیا قسەی بەتوێکڵی وای کردووە، کە دەگونجێت هەر تێشی نەگەیشتبێتن. لە باپیرم بیستووە دەیفەرموو: ڕۆژێك جەڕڕەییێکی گڵێنی ئاو بەدەست کچە بچکۆلەکانیەوە دەشکێت، لەسەر ئەمە دایکیان لێیان ئەدات ئەوانیش دەگرین، موفتیش بانگ دەکاتە ژنەکەی دەڵێت: (کچیٚ! لێیان مەدە ئەوانە جەمعی موئەنەسی سالمن جەڕڕەیان بەکەسرەیە).

بەپێی دەستوری عیلمی نەحو، جەمعی موئەنەسی سالم وەك (معلمات) بۆری بە بۆر و سەر و ژێری بە ژێر دەبێت، جا عیبارەتەکەی موفتی هەروەك ئەمە دەگەیەنێت، ئەمەش دەگەیەنێت کە ئەم منالانە کچن، جەڕڕە و گۆزەیان بەدەستەوە دەشکێت کەواتە لێیان مەدە.

دیسان دەگێڕنەوە: هەموو جارێك کە (ئەمجەد ئەفەندی) کوڕەزای بە منالی چووەتە بەردەمی، موفتی پێی وتووە: (تحب أباك أمجد)؟ واتە: ئەمجەد باوکتت خۆش دەوێت؟ یاخو: باوکت خۆش دەوێت یان باپیرت؟

هەمدیسان دەگێڕنەوە: کاتێك دەوڵەتی تورك دەیەوێت لە بەغداد عەسکەر بگرێت، بە فیتی پیاوە گەورەکان، ئەهالی هەموو گەڕەکەکان کۆدەبنەوە و بەهەرا و هوریا

---

(١) ئەم ئایەتە حیکایەتی ئەو دەمە دەکات کە ئیبراهیم پێغەمبەریان خستووەتە مەنجەنیقەوە، خوا بەم ئایەتە فەرمان دەدات بە ئاگرەکە کە سارد ببێتەوە و نەیسوتێنێت.

هێرش دەبەنە سەر سەرا، والی (مەدحەت پاشا) فەرمان دەدات هەرچی پیاوە گەورەکانی بەغداد دەبێت لە سالۆنی سەرادا کۆیان دەکەنەوە، لەبەرچاوی ئەوان فەرمان ئەدات کە پاپۆڕێك بە دیجلەدا سەرکەوێت و ئەو سالۆنەی کە پیاوە گەورەکانی تێدایە بیداتە بەر تۆپ، گەورەکانی بەغداد کە ئەمە دەبینن پەلەپەل هەریەك جواب دەنێرێت بۆ دەستەی خۆی کە بڵاوەی لێبکەن، تا پاپۆڕەکە دەگاتە پێشەوە کەس لە نـزیکی سەرا نامێنیّ، والی کە ئەمە دەبینێت بە تورکی بە موفتی دەڵێت: (زهاوی افندی! بغداد لیلر قرغەیە بگزەرلر، دانە گورد کلرندە بردن طوپلانیرلر، فقط صاچمە گورد کلرندە قاچارلر) واتە: زەهاوی ئەفەندی بەغدادیەکان وەك قەلەڕەش وانە، کە دان ببینن بەجاریّ لێی کۆدەبنەوە،بەڵام کە ساچمەیان دی ئەفڕن.

زەهاویش کتوپڕ دەڵێت: (اما صاچمە) یەعنی: نەخوازەڵڵا کە ساچمەکەش بەهێز بێت وەك ساچمەی ئەم تۆپە، یاخو: (صاچ مە) یەعنی: ئەم ساچمانە بە تۆپ بڵاوی مەکەرەوە، یاخو: ئەمەی تۆ دەیڵێیت (صاچمە)یە، واتە: قسەی پڕ و پوچە.

لە ئەمجەد ئەفەندی زەهاویم بیست فەرموی: باپیرم هەر قسەیەکی بکردایە بە توێکڵ بوو، تەنانەت بۆی گێڕامەوە فەرموی: لەپاش مردنی باپیرم بە چەندساڵێك (عادل)ی برام لەدایك بوو، منیش چووم بۆ مەکتەبی حقوقی ئەستەمبوڵ، لەویّ گرێیەکم هاتە پێش، هەرچەندم دەکرد ڕزگارم لێی نەدەبوو، شەوێك لە خەوما باپیرم دی بانگی کردم (عادل)، منیش وتم قوربان من ئەمجەدم عادل نیم،لە خەوەکەم ڕاپەڕیم، زۆر سەرسام بووم کە باپیرم چۆن من بە عادل دەزانێت، لەگەڵ ئەمیشە کە منی دیوە و عادلی نەدیوە، لە پاشا وتم ببیّ و نەبیّ ئەم قسەیەشی دەبێت بە توێکڵ بێت، هاتم تەماشای وتەی (عادل)م کرد لە فەرهەنگی عەرەبیدا، کە دەبینم (عادِلْ) هاتووە بە فیعلی ئەمر لە (عادَلَ یُعادِلُ) بە مانای: لەسەرخۆبە و ورد بەرەوە. ئەمجەد ئەفەندی فەرموی: لەگەڵ ئەوەی کە لە لوغەتی عەرەبیدا زۆر ئاگاداربووم ئەم مانایەم

نەدەزانی تا ئەو دەمە و تێگەیشتم مەبەستی باپیرم ئەمەیە لەو کارەی هاتووەتە پێشم ورد ببمەوە و لەسەرخۆ بم، ئیتر منیش لە کارەکەدا تێبینیم کرد تا بە ئاسانی ڕزگارم بوو.

موفتی لە هیچ کاتێکدا لەسەر قسە دانەماوە، بەڵام خۆی دەڵێت: جارێکیان لە کۆڵانێکی بەغدادا تووشی عەرەبێکی ڕووتەی ڕیش سپی بووم، کەرێکی دابووە پێش خۆی، بە توانجەوە پێموت: (إلى أين يا أبا الحمار؟) واتە: بۆ کوێ دەچیت ئەی باوکی کەر، واتە خاوەن کەر، ئەویش کتوپڕ وتی: (إلى السوق يا ولدي) واتە: بۆ بازاڕ دەچم ئەی کوڕی خۆم، موفتی دەڵێت: جوابەکەیم ئەوەندە بەلاوە گورج و گۆڵ و جوان بوو سەرم داخست و ڕۆیشتم.[1]

---

(١) پێموایە کابرای عەرەب نە لە پلارەکەی موفتی گەیشتووە، نە بە جوابەکەیشی ئەو نوکتەیەی مەبەست بووە کە موفتی تێی گەیشتووە، بەڵام موفتی چونکە بە قسەکەی خۆی پلاری مەبەست بووە، بۆیە مانای وەڵامەکەی ئەویشی والێك داوەتەوە.

وێنەی ئەمە: جارێکیان چەند مەلایەك لە سلێمانی دەچن بۆ دیدەنی مەلا محەمەدی چایی، لەوێ بەڕێکەوت قسە لەم حەدیسە کێویلەیە دەکەن کە بەدەمی پێغەمبەرەوە هەڵبەستراوە، کە گوایا فەرمویەتی: (أكثر أهل الجنة البلهاء) واتە: زۆرترینی بەهەشتیی خەڵکی گێل و گەمژەن، لەو میانەدا مەلا ڕەشید بەگ بە مەلا محەمەدی چایی دەڵێت: خۆزگەمان بەخۆت کە بەهەشتیت! ئەمیش بەبێ ئەمەی کە تێبگات دەڵێت: الحمد لله هەموو لایەکمان بەهەشتین.

# غیرەتی کوردایەتی موفتی

موفتی کوردێکی مەرد و خوێنگەرمێکی نەبەرد بووە، هەمیشە ئاگاداریی کوردەکانی کردووە، هەرکامێکیان ڕۆژگاری ناهەموار ناچاری کردبێت بە کۆچکردن و چوونە بەغداد، موفتی زۆر چاك دەستی گرتووە، لەلای والی یان موشیر، یان هەرکەسێکی تر بووبێت، تکای بۆ کردووە تا دایمەزراندووە، لە کاتی موفتی دا هەموو مەدرەسە گەورەکان و مزگەوتە نایابەکانی بەغداد بەدەست زانایانی کوردەوە بووە.

موفتی لەناو ماڵ و منداڵی خۆیدا قسە و گفتوگۆی هەر بە کوردی بووە و وەسیەتیشی کردووە بۆ نەوە و وەچەکانی کە لەدوای خۆشی هەر بە کوردی قسە بکەن.

جەمیل صیدقی زەهاوی دەیوت: باوکم زۆر حەزی لە شیعری شاعیری نەخوێندەواری کورد (عەلی بەردەشانی) کردووە و زۆر شیعری ئەوی لەبەر بووە، زستانان بە شەو دایدەناین، شیعری ئەوی بۆ دەخوێندینەوە.

موفتی هەروەك دەستی کوردەکانی گرتووە بە هەموو هێز و توانای خۆیەوە پاسی ناونیشانیشی کردوون و بە هەموو ڕەنگێك و لە هەموو شوێنێك لەسەریان هەڵی داوەتێ و غیرەتی کوردایەتی هاتووەتە جۆش و خرۆش.

دەگێڕنەوە: کە جارێکیان موفتی لەلای والی دەبێت و لە ناوەندی هەردووکیانا سەرینێك دەبێت، لەو کاتەدا کوڕی حەسەن قولی خانی والی لوڕستان دەچێتە لای والی، وادەردەکەوێت کە والی لە قسەکانی خۆشنوود نەبووە، لە پاش هەستانی کوڕەکەی حەسەن قولی خان، والی ئەمە فەرامۆش دەکات کە موفتی کوردە، دەڵێت: توخوا موفتی ئەفەندی! فەرق چیە لەبەینی کورد و کەردا؟ ئەمیش کتوپڕ دەڵێت: پاشا فەرق لە بەینیاندا ئەم سەرینەیە! والی کە بیری دەکەوێتەوە موفتی کوردە زۆر شەرمەزار دەبێت، داوای بەخشین و لێبوردنی لێدەکات.

هەر لەسەر ئەمە موفتی تەرکی هاتوچۆی والی دەکات، ڕۆژێك والی لە ڕووی گلەییەوە ئەم ئایەتەی بۆ دەنوسێت: (أَسْتَكْبَرْتَ أَمْ كُنْتَ مِنَ الْعَالِينَ) (ص: ٧٥)، موفتیش لە داوێنی کاغەزەکەیەوە بۆی دەنوسێتەوە: (لا ولا)، موفتی بە دیمەن وەڵامی والی دەداتەوە، بەڵام ئیشارەت دەکات بۆ ئەم نیوە شیعرە کە دەڵێت: (لا أرى القرد ولا القرد يراني).(١)

دووبارە دەگێڕنەوە: کە جارێکیان لە بەغداد لە کۆڕێکی گەورەدا باسی کوردە فەیلییەکان دەکرێت، کە گوایا هەموو کۆڵ کێشی دەکەن، یەکێکیان دەڵێت: (لولا الأكراد لهلكت الحمير ببغداد) یەعنی: ئەگەر کوردەکان نەبن کەری شاری بەغداد ناوکەڕیژ(٢) دەبن. ئەم قسەیە بە موفتی دەگاتەوە، ئەمیش کتوپڕ دەڵێت: (نعم نعم صدقوا، لولانا لهلكوا) یەعنی: بەڵێ بەڵێ ڕاست دەکەن، ئەگەر ئێمە نەبین ئەوان ناوکەڕێژ دەبن.

دیسان دەگێڕنەوە: کە ئەمین ئەفەندی ناوێکی کورد بووە لە بەغداد جارێك بەدەمیدا هاتووە وتویەتی: من کورد نیم. موفتی کە ئەمە دەبیستێت دەڵێت: ڕاست دەکات، هەڵبەتە دایکی پێی وتووە !.

---

(١) تەواوی شیعرەکە بەم شێوەیەیە:

**قالت الهرة قولاً جامعاً كل المـــــعاني**

**أشتهي أن لا أرى القرد ولا القرد يراني**

ئەمە وەك پەندێك لە زمانی عەرەبیدا بەکاردێت لە کاتی حەزنەکردن لە بینیی کەسێك. (ئامادەکار)

(٢) ناوکەڕێژ: وڵاخێکە کە پشتی لە ئاستی ناوکی بریندار بووبێت بەهۆی گرتنی بار یان زین یان کورتانەوە. (فەرهەنگی خاڵ/ ل٥٨٤.). (ئامادەکار)

# شیعر و شاعیرێتی موفتی

موفتی ئەمەندەی زانا و پێشەوا بووە ئەمەندەش بە سروشت شاعیرێکی کتوپڕیی بووە لە زمانی کوردی و فارسی و تورکی و عەرەبیدا، خاوەنی بیری زۆر بەرز و شێوەی ڕەوان و مەبەستی جوان و مانای دوور و قوڵە، هەروەك خۆی دەڵێت:

**لو بِحَسبِ الحسبِ المرءُ علا فوق معالي**

**كنتُ بالعلم وبالشعر على العالم عالي(١)**

یەعنی: ئەگەر مرۆڤ بە وەجاخزادەیی ژوور هەموو کەسێك بکەوێت، من بە زانایی و شاعیریی ژوور هەموو کەسێك دەکەوم. بەڵام لەگەڵ ئەمیشە خۆی بە شیعرەوە زۆر خەریك نەکردووە، سا ئەگەر هەلێك هەڵکەوتبێت شیعرێك، یان چەند شیعرێکی کتوپڕیی تیا وتووە، جا لەبەر ئەمە موفتی ئەمەندەی بە زانایی ناوبانگی دەرکردووە، بە شاعیریی ناوبانگی دەرنەکردووە، تەنانەت قەصائیدیم نەدیووە، تەنها سیان نەبێت، یەکێکیان بە فارسی و ئەوانی تریان بە عەرەبی، کە لەمەولا دەیاننوسین.

شاعیری بەناوبانگ (مەعرووف ڕەصافی) کورد وتوویەتی: ئەوەندەی من و (جەمیل صیدقی زەهاوی) بە شیعرەوە خەریکین ئەگەر موفتی زەهاوی نیوەی ئەوە بە شیعرەوە خەریك ببوایە گەلێ گەلێ لە ئێمە شاعیرتر و شیعری زۆرتر دەبوو.

موفتی هەرچەند بە شیعرەوە خەریك نەبووە، کەچی لەگەڵ ئەمەشدا کە ورد دەبیتەوە، لە شیعرەکانیەوە دەردەکەوێت کە لە سەرچاوەیەکی ڕوون و ڕەوانەوە هەڵقوڵاون و لە دەریایەکی زۆر قوڵی گەورەی بێ بنەوە هەڵگیراون، جگە لەمە زۆرتر مانای شیعرەکانی نەو دیمەن و نەوتراون.

بەڵام — داخی بەجەرگم— ئەو شیعرانەی کە بوویەتی کۆنەکراونەتەوە، هەر شیعرێکی کەوتۆتە لایەك، بێگومانم هەزاران شیعری موفتی لەگەڵ ئەو کەسانەی کە

---

(١) ئەم شیعرەم لە مەلا غالبی خانەقینی بیستووە.

لەبەری بووە و مردوون، کراون بە ژێر خاکەوە و چونەتە پەردەی نەبوون، یاخود لە کون و قوژبنی کتێبخانەکاندا ماونەتەوە تا بزن دەیانخوات، یان دلۆپە لە ناویان دەبات، یان ئاگریان پیێ دەکرێتەوە.

بیستم کە لە کتێبخانەکەی موحامی (مامۆستا عەبباس عەززاوی)دا سێ (٣) قەصیدەی فارسی زۆر بەرزی موفتی هەیە، کە یەکێکیان بەبۆنەی هاتنی (ناصر الدین شا) وە بۆ بەغداد وتوویەتی، دوانەکەی تریشی هەر یەکەی بە بۆنەیەکەوە وتووە. بەتایبەتی لە ساڵی (١٩٤٧)ز دا چووم بۆ بەغداد بۆ لای، هەرچەند داوای قەصیدەکانم لیێ کرد، نەیدا و بەهانەیەکی هێنایەوە، دوای ئەوجارە دوو سەفەری تر کە چوومەوە بۆ بەغداد بەتایبەتی چوومە لای، تکام لیێ کرد ڕیێ بدات وێنەیەکی قەصیدەکان بگرمەوە، بەڵام تکاکەم بە هیچ دەرچوو، ئەتوانم بڵێم ئەمە پێنج ساڵە چاپی ئەم کتێبەم دواخستووە بەتەمای ئەو قەصیدانە، تا بیێ هیوا بووم لێی[1]، خولاصە ئێجگار زۆرم هەوڵداوە تا ئەم چەند شیعرانەی موفتیم کۆکردووەتەوە.

موفتی لە گەلێك بابەتەوە شیعری هەیە، لە ستایش (مناجاة)، تاك و تەنیایی خودا (توحید)، فەلسەفە، سکاڵا لە دەست ڕۆژگار، لەگەڵ پەند و ئامۆژگاریی، دڵداریی، شیعری نەستەق و بەتوێکڵ، لاواندنەوە (رثاء)، زەم، شیعری تەقریز، مەتەڵ، شیعری پەڕاگەندە[2]، کە هەریەکە بەبۆنەی شتێکی تایبەتییەوە وتوویەتی.

---

(١) سوپاس بۆ خودا ئەم چەند قەصیدەیەی مامۆستای خاڵ باسی لێوەدەکات توانیم بەدەستی بێنم لە کاتی ئامادەکردنی ئەم کتێبەدا، لە ڕێگەی بەڕێز (مامۆستا شێخ محەمەد عەلی قەرەداغی) یەوە، لە کۆتایی ئەم کتێبەدا بە پاشکۆیەك زیادم کردووە. (ئامادەکار)

(٢) پەڕاگەندە: وشەیەکی فارسییە، واتە: پەرش و بڵاو. (ئامادەکار)

# شیعری ستایشی

لە ستایشی موفتییە ئەم دوو شیعرە عەرەبییەی:

**یــارب حــــارت في ثناك عــقولُ**
**ماذا عســـى فيك العقولُ تقولُ**

**إن الـــوجود ثنى عليك بأسره**
**فثناء أهل الفضل فيك فضول(١)**

واتە: خودایە! هەرچی ژیریی (عەقڵ) هەیە لە ستایشتا سەرسامە، نازانێت چی بڵێت، جیهان بەجارێك ستایشت دەكات، ئیتر ستایشت لەلایەن زانایانەوە بێ هودەیە.

هەر لە ستایشیەتی ئەم دوو شیعرە فارسییەی:

**جـــــز از تو كـــس نـــكند دردرا دوا**
**غير از تـــو كس ندهـــد حـــاجتی روا**

**خواهیم حاجت خود از تو نه ز ماسوی**
**با مـــا در احـتـــیاج بود ماسوی سوا(٢)**

واتە: خودایە! تۆ نەبێت كەس دەردێك دەرمان ناكات، تۆ نەبیی كەس نامانگووریەك(٣) لانابات، خودایە! پێویستی خۆم هەر لە تۆ داوا دەكەم، چونكە بێجگە لە تۆ هەموو كەسێك وەك من چاوەڕوانی دەستی تۆن.

---

(١) ئەم ڕوباعییە بە خەتی شێخ حوسێنی قەرەداغی لە پشتی كتێبی (قازی) نووسراوە، كە ئێستا لای شێخ نوری باباعەلییە و لەگەڵ شوێنی تریش دیومە.

(٢) ئەم ڕوباعییەم لە مەلا غالبی خانەقینی بیستووە.

(٣) نامانگووری: نەدارایی، دەستكورتی، نەبوونی. (فەرهەنگی خاڵ/ ل٥٨١). (ئامادەكار)

هەر لە ستایشیەتی ئەم شیعرە فارسییەی:

**حسـن یکی جلوه برون از شمار**

**بحر یکــی موج هـــزاران هزار[1]**

واتە: جوانی یەکێکە وەلێ نمایش و جیلوە لە ژمارەدا نیە، چونکە لە هەموو شتێکدا جیلوە و نمایشێکی خوای تیا نمایانە، دەریای زانین یەکێکە، بەڵام شەپۆلی هەزاران هەزارە.

(١) ئەم شیعرەم لە مامۆستا ئەحمەد حامیدی صەڕاف بیستووە.

# شیعری تاك و تەنیایی خودای

لە شیعری موفتییە لە تاك و تەنیایی خودا ئەم دوو شیعرە فارسییەی:

**تــا چند ز غیر جویم اســرار نهان**

**تاكی بحــوالیی دلیــل و برهـــان؟**

**شمس است دلیل شمس تابان تابان**

**ای دوست بیا مرا ز برهان برهان**[1]

واتە: تاكەی لەم و لەو داوای دەرخستنی نهێنی خوا بكەم؟ بە دەوروپشتی بەڵگە و نیشانەدا بسوڕێمەوە بۆی؟ چونكە ڕۆژ هەر خۆی نیشانەی خۆیەتی، كەواتە خوایە! ڕزگارم كە لە جوست و جۆی بەڵگە و نیشانەت.

هەر لە تاك و تەنیایی خوایەتی ئەم دوو شیعرە فارسییەی:

**ز درك حضرت ذاتش عقـول محجوبند**

**ســرادقات جمال و جلال گشته حجاب**

**خیال و وهم تك و پوی را زدند و بسی**

**بـهیچ وجـه نبردند ره بصوب صــواب**

واتە: لە دۆزینەوەی زاتی خوادا هەموو ژیرێك چاوی بەستراوەتەوە، پەردەی جوانیی و گەورەیی ئەو بووە بە دیوار لە ناوەندی خواو بەندەكانیا، یاد و بیر لە ڕێی دۆزینەوەی ئەودا زۆریان هەڵمەت بردو خۆ كوتا، بەڵام بە هیچ ڕەنگێك پەییان بە زاتی ئەو نەبرد.

---

(١) ئەم ڕوباعییە و ڕوباعەیەكەی دوایی بە خەتی مەلا محەمەدی كەوانەدۆڵیی، كە موجازی موفتی بووە نوسراوە، لە پشتی كتێبێكی دەستخەت كە ئێستا ئەو پەڕەیەیم لایە.

# شیعری فەلسەفەیی

موفتی گەلێ شیعری هەیە لە بابەت فەلسەفەی ژین و گوناح و هێندێ شتی ترەوە، زۆر جوان و شایستەن، کە لە دوای شیعری ستایش و تاك و تەنیایی خوداوە وەی بنوسرێن.

موفتی لە پاش ئەوەی کە لە بەغداد ناسراو دامەزرا، بوو بە مودەڕڕیسی ڕەسمی، ئینجا بە (رئیس المدرسین)، ئینجا بە موفتی بەغداد و بوو بە هاوشانی والیی و موشیر و معاشێکی زۆری بۆ بڕایەوە، ئیتر کەوتە خۆشیەوە، شاهانە ڕای بواردووە، بەڵام لە پاش ئەوەی کە پیر بووە و عومری گەیشتۆتە نەوەد و ئارەزووی دونیای کەم بووە، ڕۆژێك تەماشای ئاوێنە دەکات و خۆی بە پیاوێکی پیری ئیفتادەی[1] تێ قوپاوی ڕیش سپی دێتە پێش چاو و بەم بۆنەیەوە بیرێك دەکاتەوە لە ژینی ڕابوردوی خۆی، هەروەك شریتێکی سینەما کە بە پێش چاویدا ڕۆیی بێت، یان خەوێکی دیبێت وادەزانێت و تاسێکی[2] بەسەردا دێت و لەو تاس بردنەوەیەدا ئەم چوار شیعرە عەرەبییە دەڵێت:

بان لـــــي في المرآت شيخٌ كبيرٌ
عـــاش حـــــتى تعرّف الأحوالا

قلتُ كم عشتَ قال تسعين عاما
قـــلتُ ماذا فعلت فيهـــا فقالا

(١) ئیفتادە: ئادەمیزادی پیری کەفتەکار. (فەرهەنگی خاڵ/ل٢٣).(ئامادەکار)

(٢) تاس بردنەوە: واق وڕمانێکە دێت بەسەر مرۆڤدا لە کاتی بیستن یان بینینی شتێکی سەیردا. (فەرهەنگی خاڵ/ ل١١٤). (ئامادەکار)

أكلات دفعتـــها فـــضــــلات

وشـــــروبـــا أرقتهــــا أبوالا

وثـــيابا لــــبستُـــها فـاخرات

جـدا قــد نـزعتها أســـمالا[(١)]

واتە: لە ئاوێنەدا پیرێکی کۆنە ساڵی وام دیی کە ئەوەندە ژیابوو تا لە هەموو شت گەیشتبوو، پێموت: عومرت چەندە؟ وتی: نەوەد ساڵ، وتم: چیت تیا کردووە؟ وتی: چەند جارێك خواردن و خواردنەوە کە دام ناوەتەوە، چەند کاڵایەك کە بە تازەیی لەبەرم کردوون و بە کۆنی دامکەندوونەتەوە.

هەر لە فەلسەفەیەتی ئەم ڕوباعییە فارسییەی:

چون بخارد پشت من انگشت من

خـــم شود از بار منت پشت من

همتی كن تا نخارم پشت خويش

وارهـــــــم از منت انگشت من[(٢)]

واتە: کاتێ پشتم بخورێنم بە پەنجەی خۆم، پشتم کۆم ئەبێتەوە لەژێر باری منەتی پەنجەما، خوایە! یاریدەیەکی وام بدە کە پشتم نەخورێنم، تا ڕزگار ببم لە منەتی پەنجەم.

هەر لە فەلسەفەیەتی ئەم ڕوباعییە فارسییەی:

چون علت رعشه شد نمايان در تن

نــــزديك بود جدايى جان ز بدن

---

(١) ئەم شیعرانە (جەمیل صیدقی زەهاوی) بەناوی باوکیەوە وەریگرتوون و خستونیە ناو درێژی خۆیەوە لە یەکێ لە دیوانەکانیدا.

(٢) ئەم ڕوباعییەم لە حاجی مەلا محەمەد نوری کوڕی مەلا ئەحمەدی کوێر وەرگرتووە.

**هرگـــــاه بشود زلزله اندر خانه**

**تعجيل كند خانه‌نشين در رفتن[1]**

واته: مرۆڤ كه له‌به‌ر پیریی ئه‌ندامی هاته له‌رزین، ئیتر كاتی مردن و گیان جیابوونه‌وه‌یه‌تی، چونكه بومه‌له‌رزه كه كه‌وته خانوویه‌كه‌وه، دانیشتووه‌كانی خێرا ده‌رده‌چن.

هه‌ر له فه‌لسه‌فه‌یه‌تی ئه‌م ڕوباعییه فارسییه‌ی:

**تا بود خرد هميشه بودم محزون**

**رستم زغم و غصه دوران بجنون**

**اينســـت علاج قطع حزن و اكدار**

**تا انچه بگفت ارسطو و افلاطون**

واته: تا ژیر بووم هه‌میشه دڵته‌نگ بووم، له سایه‌ی شێتییه‌وه ڕزگار بووم له خه‌فه‌تی ڕۆژگار، به‌ڕاستی هه‌ر شێتییه ده‌رمانی هه‌موو خه‌فه‌ت و دڵته‌نگییه‌ك، نه‌وه‌ك زانین و په‌یڕه‌وی قسه‌ی ئه‌فلاتون و ئه‌ڕستۆ.

هه‌ر له فه‌لسه‌فه‌یه‌تی ئه‌م ڕوباعییه فارسییه‌ی:

**هركس شده مبتلا بســـكر غفلات**

**زين سكر افاقه نبود تا عرصـــات**

**وان وقت بود تنگ و نباشد فرصت**

**تـــا آنچه بود تلافيات مـــا فات**

واته: هه‌ركه‌سێك دووچاری سه‌رخۆشی و بێئاگایی ببێت، له‌و سه‌رخۆشییه ڕزگاری نابێت تا ڕۆژی دوایی، ئه‌و ڕۆژه‌ش زۆر ته‌نگ و چه‌ڵه‌مه‌یه، كه‌س ناتوانێت قه‌ره‌بووی ڕابردووی تیا بكاته‌وه. هه‌ر له فه‌لسه‌فه‌یه‌تی ئه‌م شیعره فارسییه‌ی:

---

(١) ئه‌م ڕوباعییه و دوو ڕوباعییه‌كه‌ی دوایی به خه‌تی مه‌لا محه‌مه‌دی كه‌وانه‌دۆڵیی نوسراونه‌ته‌وه و له لامه.

**خطا بر ماست لازم تا شود غفاريش ظاهر**

**جـــزا اعدام مى باشد گناه بى گناهيرا**[1]

واتە: پێویستە گوناه بکەم، تا چاوپۆشی و میهرەبانی خوا دەرکەوێت، تۆڵەی گوناهی ئەوانەی کە گوناه ناکەن مردن و چوونەوەیانە بۆ پەردەی نەبوون. واتە: فریشتە و گیانداری بێ زمان بۆیە لە ڕۆژی دواییدا وەك ئادەمیزاد بە ئێجگاری نامێننەوە چونکە بێ گوناهن. چەند جوانە ! ! لەم نیو شیعری دووەمەدا کۆکردنەوەی (جزا، اعدام، گوناه).

هەر لە فەلسەفەیەتی ئەم شیعرە عەرەبییەی کە لە مانای شیعرەکەی پێشویایەتی:

**لقد حُـــرم الأمـــلاكُ نيلَ خلافة**

**فما لهم ذنبٌ سوى عدم الذنب**[2]

واتە: فریشتە بێبەشکراوە لە خاوەنداریی سەر زەوی، هیچ گوناهێکیشیان نیە تەنیا بێ گوناهی نەبێت. واتە: چونکە بێ گوناهن شایستەی خاوەنداریی سەر زەوی نین.

هەر لە فەلسەفەیەتی ئەم شیعرە فارسییەی کە لە مانای دوو شیعرەکەی پێشوویایەتی:

**بـــخطا شـــويم شايان بمراحم خدايى**

**نكند شكار رحمت بجز آهوى خطايى**[3]

واتە: بە گوناهکردن ئەبم بە شایستەی میهرەبانیی خودا. واتە: ئەگەر گوناه نەکەم خوا لێم خۆش نەبێت میهرەبانی ئەو دەرناکەوێت. ڕاوچی ڕەحم ناکات بە ئاسکی

---

(١) ئەم شیعرەم لە مەلا غالبی خانەقینی بیستووە، لە پشتی تەهزیبەکەی شێخ عەلی قەرەداغیش نوسراوە.

(٢) ئەم شیعرەم لە مەلا غالبی خانەقینی بیستووە.

(٣) ئەم شیعرەم لە مەلا غالبی خانەقینی بیستووە، لە پشتی تەهزیبەکەی شێخ عەلی قەرەداغیش نوسراوە.

(خەتا) و (خۆتەن) نەبێت، کە ناوی دوو شوێنە لە چین. واتە: ئاسکی غەیری خەتا و خۆتەن کە ڕاو بکرێت بۆ سەربڕین و گۆشتەکەیەتی، بەڵام ئاسکی خەتا و خوتەن بۆ ڕاگرتن و میسکەکەیەتی. واتە: هەروەك ئاسك تا (خەتایی) نەبێت ڕەحمی پێ ناکرێت، منیش تا (خەتایی) نەبم، واتە خەتام نەبێت ڕەحمم پێ ناکرێت.

هەر لە فەلسەفەیەتی ئەم شیعرە فارسییەی:

**از فکر شرحه شرحه دلا همچو شانه باش**

**آسان نمی توان ســـر زلف سخن گرفت**[1]

واتە: ئەی دڵ! لە ڕێی بیرکردنەوە و وردبوونەوەدا لەت لەت و پارە پارە[2] بە وەك دانەی شانە، چونکە ئەگەر وانەبیت ناتوانیت بە ئاسانی سەری زوڵفی قسە و گفتوگۆ بگریت. واتە: هەروەك شانە تا دانە دانە نەبێت ناگاتە زوڵفی دڵدار و بە کامی خۆی ناگات، دڵیش تا لە بیرکردنەوە پارەپارە نەبێت، ناتوانێت دەم لە هەموو باسێکەوە بدات.

هەر لە فەلسەفەیەتی ئەم شیعرە عەرەبییەی:

**مُـــعظّمُ خـــلقِ اللهِ فیهم معزّزٌ**

**لهذا تُحاذی بالعیون المَناظِرُ**[3]

واتە: هەرکەسێك بە چاوی سەنگین و گران تەماشای خەڵکی بکات خۆشی سەنگین و گران دەبێت لە ناویانا، جا هەر لەبەر ئەمەیە کەوا چاویلکە هەمیشە ئەخرێتە سەرچاو. واتە: چونکە شت بە گەورە دەبینێت، بۆیە خۆشی وا خۆشەویستە.

هەر لە فەلسەفەیەتی ئەم شیعرە فارسییەی:

**ناکس ار بالای دست کس نشیند عیب نیست**

**روی دریا خس نشیـند زیر دریا گوهراست**[4]

---

(١) ئەم شیعرە عەبدوڵڵا جەودەت لە حاشیەی تەرجەمەی ڕوباعیاتی عومەر خیامیا نوسیویەتی.

(٢) پارە: پارچە. (پارە پارە) واتە: شتی هەلا هەلا. (فەرهەنگی خاڵ/ ل٧٧). (ئامادەکار)

(٣) ئەم شیعرەم لە مەلا غالبی خانەقینی بیستووە.

(٤) ئەم شیعرەم لە مەرحوم ئەمین زەکی بەگ بیستووە.

واتە: ناکەس ئەگەر بە پایەو جێگا پێش کەس بکەوێت نەنگ نیە، چونکە هەمیشە پوش و پەڵاش سەر دەریا دەکەوێت و گەوهەر و بەردی بەنرخیش ژێری.[1]

هەر لە فەلسەفەیەتی ئەم شیعرە فارسییەی:

**دنیا بعـــــینه چـــــــو حبابیست هیچ و پوچ**

**پوچ است بنگری چوشکست است گشت هیچ[2]**

واتە: دونیا وەك بڵقی سەر ئاو هیچ و پووچە، واتە: تا هەیە پووچە، کە نەش ما دەبێت بە هیچ.

هەر لە فەلسەفەیەتی ئەم شیعرە فارسییەی:

**خـــورشید چو بر آینه تابان گردد**

**آینه أنا الشمس نگوید چه کند؟[3]**

واتە: ڕۆژ کە دای لە ئاوێنە ئیتر ئاوێنەکە ناچارە کە بڵێت من ڕۆژم، چونکە ڕۆژەکەی بە تەواوی تیایە.

هەر لە فەلسەفەیەتی ئەم شیعرە فارسییەی:

**در مـیان جبر و تفویض اختیاری هست و نیست**

**همچو آن ماهی که مـــــی آید فرود از آبــشار[4]**

مانای ئەم شیعرە لە حاشیەی سەر تەرجەمەی رسالە فارسیەکەی موفتیدا دەنوسین لە بابی (تەئلیفی)دا.

هەر لە فەلسەفەیەتی ئەم شیعرە فارسییەی:

---

(١) ئەم شیعرە و ماناکەی لە چاپی پێشوودا لێرەدا لە یاد کراوە و نەنوسراوە، بەڵام لە ڕێگەی دەستنوسەکەی مامۆستای خاڵ توانیم ڕاستی بکەمەوە و زیادی بکەم. (ئامادەکار)

(٢) ئەم شیعرەم لە مەلا عەبدوڵڵای چروستانی بیستووە.

(٣) ئەم شیعرە لە پشتی تەهزیبەکەی شێخ عەلی قەرەداغی نوسراوە.

(٤) ئەم شیعرەم لە حیکمەت زەهاوی بیستووە.

**بعزم دیدن لیـــلی مپوی صحرارا**

**زخود بجوی سیه چادر سویدارا**[١]

واته: بۆ بینینی خۆشەویست چۆڵ و بیابان مەبڕە، بەڵکو هەر لە کراسی خۆتا بگەڕێ بۆ ڕەشماڵی ئەو، کە ناوەڕاستی دڵتە.

هەر لە فەلسەفەیەتی ئەم شیعرە فارسییەی:

**گـــــرگ اجل یکایك ازین گله می برد**

**وین گلەرا نگر که چه آسوده می چرد**[٢]

واتە: گورگی مەرگ یەك بە یەك لەم گەلەی ئادەمیزادە ئەفڕێنێت، تەماشایانکە چەندە بێباکن!! بە چ ئاسودەییەك لەم پاوەندی[٣] جیهانەدا دەلەوەڕێن.

هەر لە فەلسەفەیەتی ئەم شیعرە تورکییەی:

**غـم دیور هرکیم اولورسه جمله غمدن قورتلور**

**هـــــم ألمدن هم المدن هم اولمدن قور تلور**[٤]

واتە: خەفەت دەڵێت هەرکەسێك بمرێت لە هەموو جۆرە خەفەتێکی ڕۆژگار ڕزگاری دەبێت، یەکەم لەدەست ئازار، دووەم لەدەست من، سێیەم لەدەست مردن.

لە ناوەندی (ألمدن) و(المدن) و(اولمدن)دا جیناس هەیە.

هەر لە فەلسەفەیەتی ئەم شیعرە عەرەبییەی:

**إن بنـــي أبنـــائنا أحبُّ**

**الابنُ قشرٌ والحفيدُ لبُّ**[٥]

---

(١) ئەم شیعرەم بە کاغەز لە مەلا عبدالڕەحمانی کوڕی مەلا محەمەدی کەوانەدۆڵی وەرگرتووە.

(٢) ئەم شیعرەم بە کاغەز لە مەلا عبدالڕەحمانی کوڕی مەلا محەمەدی کەوانەدۆڵی وەرگرتووە، لە پشتی تەهزیبەکەی شێخ عەلی قەرەداغیش نوسراوە.

(٣) پاوەند: لەوەڕی قەدەغەکراو. (فەرهەنگی خاڵ/ ل٨٢).(ئامادەکار)

(٤) ئەم شیعرەم لە زەینولعابدینی کوڕی مەلا فانی بیستووە.

(٥) ئەم شیعرەم لە مامۆستا ئیبراهیم شابەندەر بیستووە.

واتە: کوڕەزاکانمان لە کوڕەکانمان خۆشەویستترن، چونکە کوڕ توێکڵە و کوڕەزا کاکڵەیەتی.

# شیعری سکاڵا و پەندی

زۆر لە شیعرەکانی موفتی سکاڵان لەگەڵ پەند و ئامۆژگارییدا، بەم شیعرانەی ئەیەوێ باسی چەند دەردێکی کۆمەڵگە بکات و پێش چاویان بخات، بەڵکو چارە بکرێن.

لە سکاڵایەتی ئەم قەصیدە فارسییەی:[1]

**رســـــــیده این زمان کبر و غرور ناکسان جایی**
**که بیند خویشتن را هر مگس از عُجب عــنقایی[2]**

**گمـــارد خویشـرا هـــر ذره‌ء ناچیز خورشیدی**
**شـمـــارد خویشرا هر قطره‌ء بی قدر دریایـــی[3]**

**دریــــن ایام نبود تاجــهـــارا رتبه‌ء کفشــــی**
**وزین هنگـــام سرهارا نباشـــد عزت پایـــی[4]**

**بود مـــأوای دانایان بدهر ار هســـت پایینی**
**شـــود مأوای نادانان به کون ارهست بالایی[5]**

---

(١) ئەم قەصیدەیە لەلایەن شاعیر و زانای بەناوبانگ سەید ئەحمەد نەقیبەوە تەخمیس کراوە.

(٢) واتە: لەم ڕۆژەدا دەعیە و دەماری مرۆڤی ناوەجاخ گەیشتووە بە ئەندازەیەك کە هەموو مێشێك خۆی بە عەنقایەك دەبینێت.

(٣) واتە: هەموو شتێکی وردیلانەی بێ نموود خۆی بە ڕۆژێکی درەخشان دەزانێت و هەموو دڵۆپە ئاوێکی بێ نرخ خۆی بە دەریایەك دەژمێرێت.

(٤) واتە: لەم ڕۆژانەدا هیچ تاجێك بە قەد کەوشێك نرخی نیە، هەروەك گەلێك سەری وایش هەیە کە پێیەك ناهێنێ.

(٥) واتە: کام شوێن لە جیهاندا پەست و پایینترە، ئەوێ جێگای زانایان و دانایانە، کام شوێنیش بەرز و باڵایە ئەوێ جێگای نادانان و هیچ نەزانانە.

**هـــــزاران مدعی هـــــستند عالم در قضا لکن**
**زبان حال کس هرگز نکرد اثبات دعوایـــــی[1]**

**بـــــروخندند نادانان و گرید از پشیـــمانی**
**اگر گوید به ایشان حرف حق بالفرض دانایی[2]**

**همه مـــــختل دماغند از فساد خلط کس نکند**
**به انتیمون پند ناصـــــحان تسکین سودایی[3]**

**هـــــزاران در جهان جالوت هست و نیست داودی**
**فراوان بر زمین فرعون هست و نیست موسایی[4]**

**هـــــمه گم کرده راهانند و نبود در جهان خضری**
**همه کور و کر و لالند و پیدانیســـــت عیسایی[5]**

---

(١) واته: هەزاران کەس لافی زانایی لێ دەدات لە هەموو جۆرە عیلمێکدا، بەڵام هێشتا هیچ کامێکیان ئیسباتی دەعوایەکی خۆی نەکردووە.

(٢) واتە: ئەگەر هەر دانایەك قسەیەکی ڕاست بڵێت بە نادانێك، پێی پێ دەکەنێت، داناکەش لە پەشیمانیدا گریانی دێت.

(٣) واتە: هەموو مێشك تێکچوون، بە هۆی تێکچوونی دەروونیانەوە، کەسێك نیە کە بە ئامۆژگارییەکی دڵسۆزانەی وەك (ئەنتیمون) –کە دەرمانی سەودایە– چارەی دەردی ڕەوشت و خوی ناشیرینیان بکات، کە وەك ناساغی سەودا دایوەشاندوون.

(سەودا: دەردێکی زۆر بە ئالۆشە لە جەستەی مرۆڤدا پەیدا دەبێت، دەست و پێی شەقار شەقار دەکات. (فەرهەنگی خاڵ/ل٣٤٩) . (ئامادەکار).)

(٤) واتە: لەم جیهانەدا هەزاران جالوتی ستەمکار هەیە، بەڵام داودێك نیە کە بیکوژێت، گەلێ فیرعەونی زۆردار هەیە، وەلێ موسایەك نیە کە بیانخنکێنێت.

(٥) واتە: هەموو سەرلێشێواو و گومڕاهن و خدرێکی زیندە نیە کە بیانهێنێتەوە سەر ڕێ، هەموو کوێر و کەڕ و لاڵن، عیسایەك نیە چاکیان بکاتەوە.

هــــــــزاران آزر و بتگر عيانند و خليلى نيست
بود چون نينوى هر شـــــهر و نبود ابن متّايى[1]

بســـــى هســـــتند مرتدين دريغا نيست صديقى
قضايا مشتبـــــه باشند و دردا نيســـت مولايى[2]

شـــــياطين بى شمارنـــد و بعالم نيست فاروقى
منافق هســـــت هرجاو و حذيفه نيست درجايى[3]

ازيـــــن اوضاع ناهتـموارىى هنـــجار مى رستم
اگر مى يافتـــم (فيضى) درين گمبد دگر جايى[4]

هەر لە سكالآيەتى ئەم ڕوباعييە فارسييەى:

شــيخا تو كه در عالم ظاهر فردى
اين رتبه ز دســــتار بدست آوردى

---

(١) واتە: هەزاران بت تاشى وەك (ئازەر) هەن، بەڵام ئيبراهيمێكى خەليل نيە كە بتەكانيان بشكێنێت، گەلێك شارى وەك (نەينەوا) هەيە، بەڵام يونس پێغەمبەرى كوڕى (مەتا)ى تێدانيە كە لە سزاى خوا ڕزگاريان بكات.

(٢) واتە: موڕتەددى تازە كافر زۆرن، بەڵام ئەبوبەكرێكى صديق نيە كە بيانهێنێتەوە سەر ڕێى ئيمان و گەلێك مەسائيلى تێكەڵ و پێكەڵ هەن، وەلێ داخەكەم ئيمامێكى عەلى نيە كە لە يەكيان جيابكاتەوە.

(٣) واتە: دێو و شەيتان لە جيهاندا زۆرن، بەڵام حەزرەتى عومەرێك نيە كە شەيتانەكان لێى بترسن و ڕەوى لەبەر بكەن، موونافيقى ناپاك لە هەموو شوێنێك هەيە، بەڵام (حوزەيفە)يەك نيە كە دەريانبخات.

نيو شيعرى دووەم ئيشارەيە بۆ ئەو فەرموودەيەى حەزرەتى عومەر كە وتوويەتى: هەركەسێك حوزەيفە نوێژى لە پشتەوە نەكات بە موونافيقى دەزانم.

(٤) واتە: لەم چۆنێتيە ناڕێكە ناشرينە خۆم ڕزگار دەكرد ئەگەر لەم جيهانە بەدەر جيهانێكى ترم شك ببردايە.

**حیف است که او دور سر تو گردد**

**بایست که تو دور سر او گردی**[(١)]

واتە: ئەی شێخی نەخوێندەوار، تۆ کە ئەمڕۆ لە جیهاندا تاکیی، ئەم پایە بەرزەت لە سایەی مێزەرەکەتەوە دەست کەوتووە، کەوابوو حەیفە ئەو بەدەوری سەری تۆدا بگەڕێ، بەڵکو ئەبوایە تۆ بەدەوری سەری ئەوا بگەڕایتایە.

هەر لە سکاڵایەتی ئەم ڕوباعییە فارسییەی:

**ترکیب ملا چو در ازل از الم اســـــت**

**بیچاره نصیب او همه درد و غم است**

**شــــــادی بدلش چگونه صورت بندد**

**گر قلب کنی حاصل قلبش الم است**[(٢)]

واتە: وتەی (مەلا) هەر لە ئەزەلدا لە پیتی (الم) داڕێژراوە، لەبەر ئەمە مەلای بێچارە هەمیشە بەشی هەر داخ و زوخاوە، خۆشی چۆن جێی ئەبێتەوە لە دڵیا؟ ئەگەر پیتی (مەلا) پێچەوانە بکەیتەوە ئەبێت بە (الم) کە بە مەعنای خەم و خەفەتە.

هەر لە سکاڵایەتی ئەم شیعرە کوردیەی:

**خواهیشتە ئەگەر دائمە تۆ بتخەنە سەرچاو**

**لەم عالەمەدا عەینی درۆیە وەکو عەینەك**[(٣)]

واتە: ئەمڕۆ لەناو خەڵکیدا درۆ زۆر پەسەند و درۆزن زۆر لە پێشە، تەنانەت چاویلکەش کەوا خۆشەویست و هەمیشە لەسەرچاوانە، هەر لەبەر ئەوەیە کە درۆزنە،

---

(١) ئەم ڕوباعییە مەرحوم ئەمین زەکی بەگ لە (تاریخی سلێمانی وە وڵاتی)دا نوسیویەتی. (بڕوانە: محمد أمین زکی، تاریخی سلێمانی وە وڵاتی. (ل١٨٣). (ئامادەکار).)

(٢) ئەم ڕوباعییەم لە مەلا عەبدوڵڵای چروستانی و مەرحوم تاهیر عوسمانی کەرکوکی بیستووە.

(٣) ئەم شیعرەم لە موفتی سلێمانی مەرحوم عبدالعزیز ئەفەندی بیستووە.

هەمیشە یان شتی بچوك بە گەورە نیشان دەدات، دوور بە نـزیك دەردەخات، یان تاریك بە ڕوناك دەنوێنێت.

هەر لە پەند و ئامۆژگارییەتی ئەم شیعرە عەرەبییەی:

**لا تدعُ في حاجة بازاً ولا أسداً**

**اللهُ ربك لا تشـــرك به أحداً**[(١)]

واتە: لە كاتی تەنگانەدا هاوار نە لە عبدالقادری گەیلانی و نە لە ئیمامی عەلی بكە، بەڵكو هەر هاوار لە خوا بكە، چونكە هەر ئەوە خوای تۆ، شەریك و هاودەمی بۆ پەیدا مەكە.

هەر لە سكاڵایەتی ئەم شیعرە فارسییەی:

**حیـــفا كە دین پاك نبی را بە باد داد**

**در سنیان تشیخ و در شیعە اجتهاد**[(٢)]

واتە: زۆر حەیفە كەوا دوو شت ئاینی پاك و تەمییزی ئیسلامی بە با دا، یەكەم شێخێتی لەناو سوننی و دووەم ئیجتیهاد لەناو شیعە.

هەر لە سكاڵایەتی ئەم شیعرە توركییەی:

**عـــجبی بردنی طعن ایتسە بر عالی جناب اوزرە**

**بوگون وارینجە ظالم لكلە بولمش آفتاب اوزرە**[(٣)]

واتە: ئایا بە دووری دەزانن ئەگەر پەست پایەیەك توانج بگرێتە پایە بەرزێك؟ نەء دوور نیە، ئەمڕۆ ستەمكاری وا هەیە كە پەڵە و خاڵی ڕەش لەسەر ڕووی ڕۆژ ئەدۆزێتەوە.

هەر لە سكاڵایەتی ئەم شیعرە توركییەی:

---

(١) ئەم شیعرە مەرحوم ئەمین زەكی بەگ لە (تاریخی سلێمانی وە وڵاتی)دا نوسیویە.

(بڕوانە: محمد أمین زكی، تاریخی سلێمانی وە وڵاتی. (ل١٨٣). (ئامادەكار).)

(٢) ئەم شیعرەم لە مەرحوم سەید ئەحمەدی خانەقا بیستووە.

(٣) ئەم شیعرە و شیعرەكەی دواییم لە زین العابدینی كوڕی مەلا فانی بیستووە.

**راشـــــى و مرتشـــــى و رائشه وار در لعنت**

**نه اولور حالى عجب مى صاحبى بو اوچ علت**

واتە: لەعنەتی خودا بۆ ئەو کەسەیە کە بەرتیل ئەدات، یان وەریدەگرێت، یان دەبێت بە مایەی وەرگرتنی، ئینجا دەبێت حاڵی ئەو کەسە چۆن بێت کە خاوەنی ئەم سروشتە پیسە بێت؟

هەر لە سکاڵایەتی ئەم شیعرە عەرەبییەی:

**شـيب رأسي في شبابي لا تعدّوه عجيباً**

**إن هذا اليوم يومٌ يجعل الولدان شيباً(١)**

واتە: سەرسام مەبن لە سپی بوونی سەرم لە گەنجیما، چونکە ئەمڕۆ ڕۆژێکە بە خەم و خەفەتی خۆی منالّ پیر دەکات.

هەر لە سکاڵایەتی ئەم ڕوباعییە فارسییەی:

**عـــالمى خواهم ازين عالم بدر**

**عنصر وى خاك باشد سر بسر**

**در بـــن هر موى دستى رويدم**

**تا بكام خود كنم خاكى بسر(٢)**

واتە: جیهانێکی ترم ئەوێ لەم جیهانە بەدەر، کە عونصوری ئەو هەر خاك بێت و هیچی تر، لە بنکی هەموو موویەکی ئەندامیشم دەستێکی لێ بڕوایە، تا بە ئارەزووی دڵی خۆم خاکم بکردایە بە سەرما.

---

(١) ئەم شیعرەم لە مەلا غالبی خانەقینی و موفتی عبدالعزیز بیستووە.

(٢) ئەم ڕوباعیەم لە مەلا عارفی چنگنیانی بیستووە.

# شیعری دڵداری موفتی

لە شیعری دڵداریەتی ئەم ڕوباعییە فارسییەی:

**بە باغـم بلبـلم من کز غم دل زار مــی نالم**

**گــە از بی مهری گل، گە ز جور خار می نالم**

**میــان نالەی ما نیــست چندان فرق ای بلبل**

**تو بر رخسار گل، من بر گل رخسار می نالم**(1)

واتە: بولبولێکم لە باخا، لە داخا دەگریم، دەمێ لەبەر بێ میهرەبانی گوڵ، دەمێکیش لەبەر ستەم و ناسۆری دڕکەکەی دەناڵێنم. جیاوازییەکی ئەوتۆ لە ناوەندی ناڵەی من و تۆدا نیە ئەی بولبول، چونکە تۆ بەسەر ڕوخساری گوڵدا دەگریت و منیش بەسەر گوڵی ڕوخساردا دەگریم.

هەر لە شیعری دڵداریەتی ئەم ڕوباعییە فارسییەی:

**خــوش آنکە جان ورە بسپاریم و بسپریم**

**یــعنی کە عاریت بگــذاریم و بگـــذریم**

**مـــارا میـسر ار نشــود دیدن نگــار**

**بر لــوح، صــورتش بنگاریم و بنگریم**(2)

واتە: چەند خۆشە ئەودەمەی کە گیان بسپێرم و ڕێگای ژین ببڕم، واتە ئەم سپاردەیەی کە لەلامە — وەك گیان و ڕێگای ژین بێت– بەجێی بێڵم و بیبڕم، ئەگەر بینینی دڵبەرم بۆ ڕێك نەکەوێت، وێنەکەی لەسەر ڕووپەڕەی دڵم دەکێشم و تەماشای دەکەم.

---

(1) ئەم ڕوباعییەم لە مامۆستا ئەحمەد حامیدی صەڕاف بیستووە.

(2) ئەم ڕوباعییەم لە مەلا عارفی چنگیان بیستووە.

هەر لە شیعری دڵداریەتی ئەم ڕوباعییە عەرەبییەی:

**أضيف الدجى معنى إلى ليل شَعره**

**فــــطال ولولا ذاك ماخصّ بالـجر**

**وحـــــاجبه نون الوقاية ما وقـت**

**على شرطه فعل الجفون من الكسر**(١)

واتە: لە مانادا ئیزافەی شەوەزەنگ کرا بۆ سەر مووی دڵبەر، ڕەشی و درێژی هەردووکیان کەوتە سەر یەك، بۆیە وا مووی دڵبەر درێژ بووە بەم ڕەنگەی کە بەسەر زەوییدا ڕایدەکێشێت(٢)، برۆی دڵبەر (نون)ی وقایەیە، واتا وەك ئەو کەوانەییە، کە بە ئاخیری هێندێك (فیعل)ەوە دەنوسێت، پاسی پیتەکەی پێش خۆی دەکات لە (کەسرە)، واتە لە ژێر، بەڵام ئەم نوونی وقایەیە لێرەدا –کە برۆیەتی– پاسی

---

(١) ئەم دوو شیعرەم لە مەلا عارفی چنگنیانی بیستووە، لە پشتی (شرح مغني) یەکی کۆنیشا هەر بە ناوی موفتی زەهاوییەوە نوسراوە، بەڵام لە کەشکۆڵێکی دەستخەتی تردا بەناوی (ئەمیر ئەمین الدین عەلی کوڕی عوسمانی سەلمانی) یەوە نوسراوە.

ئەم ڕوباعییە زۆر لە ڕوباعییە عەرەبییەکەی شێخی سەعدی دەچێت لە گوڵستان دا کە دەڵێت:

**بليتُ بنحوي يصول مغاضـــــبا**

**عليّ كزيد في مقابـــلة العـــمرو**

**على جـرّ ذيلٍ ليس يرفع رأســـه**

**فهل يستقيم الرفع من عامل الجر**

(بڕوانە: سعدی شیرازی، گلستان. (ل٥١٩).

هەر دەربارەی ئەم چوارینەیەی موفتی زەهاویی، لە لاپەڕەیەك لە سەرەتای (شرح العقائد النسفيه)کەی باوکم (مەلا محەمەد ئەمینی کانی میرانی) ئەم چوارییینەیە نوسراوە بەناوی موفتی زەهاوییەوە.) (ئامادەکار)

(٢) یاخو بڵێین: بۆیە وا مووی دڵبەر وەك کەمەند تەرخان کراوە بۆ ڕاکێشانی دڵی دڵداران.

کردەوەی پێڵووی چاوی نەکردووە لە (کەسرە)، واتە لە شکاندنی دڵی دڵداران[1]، واتە دڵبەر هەمیشە بە گریشمە[2] و ناز و غەمزەی چاوی دڵی دڵداران دەشکێنێت.

چەند جوانە!! لە یەك ڕوباعی دا کۆکردنەوەی پێنج ئیستیلاحی عیلمی نەحو، وەك (ئیزافە، جەڕڕە، نوونی ویقایە، فیعل، کەسرە) بێت.

هەر لە دڵدارییەتی ئەم شیعرە فارسییەی:

**لازم دوری ز خــوبان حســرت و دیوانگی است**

**از فراق یوسف است در سجن جن در چاه آه[3]**

واتە: لازمی دوورکەوتنەوەیە لە جوانان خەفەت خواردن و شێت بوون، نابینی بەهۆی جوێبوونەوەی حەزرەتی یوسف لە (سجن) یەعنی زیندان، ئەمە کەوا ئاخیری وتەی (سجن) (جن)ە و بەهۆی دوورکەوتنەوەی یوسفە لە (چاه) واتە بیر، ئەمە کەوا ئاخیری وتەی (چاه) (آه)ە.

واتە (سجن) و (چاه) هەرچەندە گیانلەبەر نین تا بە دوورکەوتنەوەی جوانێکی وەك یوسف خەفەت بخۆن و شێت ببن، بەڵام لەگەڵ ئەمیشە ئێشتا بێبەش نەبوون لە شێتبوون، نابینی کە لە نوسیندا ئەم دوو وتەیە هاودەمی (جن) و (آه)ن.

واتە: (چاه) بۆیە ئاخیریەکەی (آه)ە، وەك بڵێی هەمیشە هەر ئاهو هەناسەی سارد هەڵدەکێشێت بۆ دوورکەوتنەوەی یوسف لێی، (سجن)یش بۆیە ئاخیریەکەی (جن)ی بە مانا (جنۆکە)یە — کە دەڵێن هەرکەسێك گوایا بی بینێت شێت دەبێت— وەك بڵێی لە داخی هاتنە دەرەوەی یوسف لێی هەمیشە خەریکە شێت ببێت!.

هەر لە دڵدارییەتی ئەم شیعرە فارسییەی:

---

(١) یان لە شکاندنەوەی چاوی ڕووە و زەوی، واتە دڵبەرەکە شەرمنە، هەمیشە چاوی داخستووە.

(٢) گریشمە: تەماشاکردن بە کلایی چاو لەگەڵ ناز و عیشوەدا. (فەرهەنگی خاڵ/ ل٤٩٢) . (ئامادەکار)

(٣) ئەم شیعرەم لە مەلا غالبی خانەقینی بیستووە.

**ای مـــصور صـــــورت یار مرا با ناز کـــــــش**

**چون بنازش می رسی بگــذر که من خود می کشم[1]**

واتە: ئەی وێنەگر! وێنەی یارم زۆر بەنازەوە بکێشە، بەڵام کە گەیشتیتە سەر گرتنی ناز و عیشوەی بیدەرە دەستم، خۆم ئەوەی بکێشم.

هەر لە دڵدارییەتی ئەم شیعرە فارسییەی:

**دل من زسینه گم شد تهمت بکس نبردم**

**به غیر تو در اینجا کســـــــی رهی ندارد**

واتە: دڵم لەناو قەفەسی سنگما ون بووە، گومانم لە کەس نیە تۆ نەبێت، چونکە هەر تۆی کە هاتوچۆی ئەوێت هەیە.

هەر لە دڵدارییەتی ئەم شیعرە فارسییەی:

**رخســار یارم چه آتشین است**

**آتش پرستم گر آتش اینست[2]**

واتە: ڕوخساری یارم وەك ئاگر ئەدرەوشێتەوە، ئەگەر ئاگر وا جوان بێت من ئاگرپەرستم.

لە ناوەندی (آتشین است) و (آتش اینست) دا جناس هەیە.

هەر لە دڵدارییەتی ئەم شیعرەی کە نیوەی کوردی و نیوەی فارسییە:

**گەهێ دەردێك ئەکا دەرمان بە قەتلی گەهـ ئەدا فەرمان**

**منـــم کز غایت حـــــرمان نه با آنم نـــــــــه با اینم[3]**

---

(١) ئەم شیعرە و شیعرەکەی دواییم لە مامۆستا ئەحمەد حامیدی صەڕاف بیستووە.

(٢) ئەم شیعرەم لە مەرحوم مەلا عارفی ئەمینی وەسمان بیستووە.

(٣) ئەم شیعرەم بە چیرۆکەکەی دواییەوە لە مەلا ئەسعەدی نەوەی (مەحوی) بیستووە.

واتە: دڵبەر هێندێ جار دەرمانی دەردی دڵدار دەکات و هەندێ جاریش فەرمانی کوشتنی دەدات، بەڵام من ئەمەندە بێ بەشم نە لە دەرمانی بەهرەمەندم و نە لە کوشتنی بەشدارم.

مەحوی ئەفەندی ئەم شیعرەی کردووە بە ڕوباعی، دەگێڕنەوە کە لە ساڵی (١٢٩١ك) مەحوی لەگەڵ چەند مەلایەکی تر لە سلێمانی نەفی دەکرێن بۆ بەغداد، لەوێ دەچێت بۆ دیدەنیی موفتی، زەهاوی لەبەر پیری و چاوکزی مەحوی ناناسێتەوە، لە میانەی قسەدا ئەم شیعرەی خۆی دەخوێنێتەوە، مەحویش دەڵێت قوربان! ئەم شیعرەت ڕوباعییە شیعرەکەی پێشووی ئەمەیە:

**وەکو مەحرومی نۆشینی مەیی ئەو لـەعلی نۆشینەم**

**لە زەوقی چەشتنی نێشی مژەیشی بێ بەشە سینەم(١)**

ئینجا موفتی دەیناسێتەوە، دەفەرموێت: ئافەرین مەحوی، بەخوا وابزانم دواییمە کە نەمناسیتەوە، ئینجا مەحوی کتوپڕ دەڵێت:

**جـــەنابی موفتی ئەفەندی ڕشێنەیەك باران**

**لـــــە دڵتی ششتەوە نەقشی محەببەتی یاران**

**خەیاڵی ئێوە بە لێشاوی tووندوتیژی سورشك**

**نـــەچۆتەوە لە عەقیقی دڵــــــی وەفادارن(٢)**

---

(١) واتە: نە ئەوەیە یار بە پێ چەشتنی شەرابی گەوارای لێوی لەعل ڕەنگی شادمانم بکات، نە ئەوەیە بە ئازاری برژانگی سینەم لەت بکات و بمکوژێت. (بڕوانە: دیوانی مەحوی. (ل٣٤٤).) (ئامادەکار)

(٢) واتە: جەنابی موفتی ئەفەندی ئەو فرمێسکانەی بەهۆی پیرییەوە لە چاوت دادەوەرێن، نەخشی خۆشەویستیی دۆستانیان لە دڵت شتووەتەوە، بەڵام بەش بەحاڵی ئێمە ئەو فرمێسکە توندوتیژەی دەرد و مەینەت کە بە چاوماندا لێشاوی کردووە، یادی ئێوەی لە دڵی خوێناویی وەك عەقیقی ئێمەی بە وەفا هەڵنەگرتووە. (بڕوانە: سەرچاوەی پێشوو. (ل٣٤٦و٣٤٧).) (ئامادەکار)

# شیعری نەستەق و بەتوێکڵی

موفتی هەروەك قسەی نەستەق و بەتوێکڵی زۆرە، شیعری نەستەق و بەتوێکڵیشی زۆرە، دەگێڕنەوە جارێکیان لە پاش کەوتنی پشکۆی سێیەمی زستان بەفرێکی گەورە دەبارێت، ئینجا بەم بۆنەیەوە موفتی ئەم شیعرە عەرەبیەی وتووە:

**قالوا السما قد أسقطت جمراتها**

**صدقوا وهذا الثلج بعض رمادها**(١)

واتە: وتیان کە ئاسمان هەموو پشکۆکانی خستەخوارەوە، بەڵێ ڕاستیان کرد و ئەم بەفرە هێندێکە لە خۆڵەمێشی ئەو پشکۆیانە.

دووبارە دەگێڕنەوە: کە موفتی لەگەڵ (مەدحەت) پاشای والی بەغدادا زۆر دۆستایەتیان خۆش و تێکەڵییان گەرم و گوڕ بووە، بە ئەندازەیەك کە ناحەزەکانی موفتی لە هەموو لایەکەوە ئاگریان تێبەربووە، دەستیان کردووە بە زماندرێژی و پلارهاویشتن بۆ موفتی، ئینجا بەم بۆنەیەوە ئەم شیعرە فارسیەی وتووە:

**یار با مـــن گرم گشت و داد دشنامم رقیب**

**سگ زبان بیرون کشد چون گرم گردد آفتاب**(٢)

واتە: دۆست لەگەڵما گەرم و گوڕ بوو، کەچی ناحەزەکانم زماندرێژییم دەربارە دەکەن و جنێوم پێدەدەن، بەڵێ سەگ زمان دەردەکێشێت کە ڕۆژ تاو بسێنێت و جیهان گەرم ببێت.

موفتی لەم شیعرەدا (مەدحەت) پاشای کردووە بە ڕۆژ، گەرمی و خۆشەویستی ئەوی کردووە بە تینی هەتاو، ناحەزەکانیشی کردووە بە سەگ، بەم ڕەنگە هەروەك

---

(١) ئەم شیعرەم لە زۆر کەس بیستووە.

(٢) ئەم شیعرەم لە حیکمەت زەهاوی و گەلێ کەسی تر بیستووە.

سەگ لە قرچەی نیوەڕۆدا زمان دەردەکێشێت لە گەرمانا، ئەمانیش لە حەسەدی گەرمی خۆشەویستی مەدحەت پاشا زمانی توانج و تەشەر درێژ دەکەن.

(جەمیل صیدقی) زەهاوی ئەم شیعرەی زۆر پێخۆش و هەمیشە بەسەر دەمیەوە بووە.

جا لەگەڵ ئەم هەموو گەرم و گوڕی موفتییە لەگەڵ مەدحەت پاشادا کەچی کە مەدحەت پاشا دەبێت بە (صەدری ئەعزەم) موفتی پیرۆزبایی نامەی بۆ نانوسێت، مەدحەت پاشا لەسەر ئەمە گلەیی نامەیەکی بۆ دەنوسێت، موفتیش بەم دوو شیعرە فارسییە نەستەقە وەڵامی دەداتەوە:

**نامـــــه ننوشتم مباد از ســــرّ ما آگه شـــوند**

**دوزبانی همچو خـــــــامه روســیاهی چون رقم**

**گر بگويم ناورم در دل ترا هرگز رواســــــــت**

**دل جحيم است از فراقت چون در آن حور آورم**(١)

واتە: کاغەزم بۆ نەنوسیت تا دوو زمانێکی وەك قەڵەم و ڕووڕەشێکی وەك نوسراوەکە ئاگادار نەبێت بەسەر نهێنیمانا، ئەگەر بڵێم هەرگیز بە دڵ یادت ناکەم ڕاستە، چونکە لە دووریت کورەی دڵ بووە بە دۆزەخ، ئیتر چۆن حۆری وێنەتان دەهێنمە ناوی.

هەر لە شیعری نەستەقیەتی ئەم ڕوباعیە عەرەبییەی:

**من صار يمشـــي بالعصا من كبر**

**آن أوان أن يــــصير راحــــــلا**

**أعني الذي عـــلى ثلاث أرجـل**

**يمشي، على الأربع يمشي عاجلا**(١)

---

(١) ئەم ڕوباعییە بە خەتی شێخ حەسەنی قەرەداغی لە پشتی کتێبی (قازی) نوسراوە.

واته: یەکێك کە لەبەر پیریی وای لێهات کە بە دار بڕوات، ئیتر نـزیکە کە بمرێت و کۆچی دوایی بکات، واتە: مرۆڤ تا گەنجە بە دوو پێ دەڕوات، کە پیر بوو دارێك دەگرێت بە دەستەوە بە سێ پێ دەڕوات، ئینجا کاتێك زانی بە چوار پێ دەڕوات، بەم ڕەنگە دەمرێت و دارتەرمەکەی بە چوار کەس هەڵدەگیرێت.

هەر لە شیعری نەستەقیەتی ئەم نیو شیعرە فارسییەی کە نیو شیعری دووەمی پێ تەزمین کردووە:

**ریش سفید فیضی خندد بر انکه گوید**

**بالاتر از ســـــــیاهی رنگ دگر نباشد**[2]

واتە: ڕیشی سپیم پێدەکەنێت بەو کەسەی کە دەڵێت: سەرەڕای ڕەشیی ڕەنگێکی تر نیە، چونکە ڕیشی من کە جاران ڕەش بوو ئێستا وا سپی بووە.[3]

هەر لە شیعری نەستەقیەتی ئەم شیعرە فارسییەی:

**نــکــرده و نکند بـــاده عقل را زائــل**

**چگونه صاحب این میشود بدان مائل**[1]

---

(١) ئەم ڕوباعییەم بە خەتی مەلا محەمەدی کەوانەدۆڵی لایە.

(٢) ئەم شیعرەم لە مەلا غالبی خانەقینی بیستووە.

(٣) بەشی دووەمی ئەم شیعرە (بالاتر از سیاهی رنگ دگر نباشد) پەندێکی باوە لە زمانی فارسیدا، بۆ کاتێك بەکاردێت کە کەسێك پرکێشی بکات و دەست بداتە کارێکی ترسناك و چاوەڕێی ئەنجامێکی خراپ بکات. لە شیعری کۆمەڵێك لە شاعیراندا هاتووە.

نیزامیی گەنجەوی دەڵێت:

**هفت رنگست زیر هفت او رنگ**

**نیست بالاتر از سیـــاهی رنگ**

هەروەها سەعدی شیرازی دەڵێت:

**در روی هر سپیدی خال سیاه دیدم**

**بالاتر از سیـــاهی رنگی دیگر نباشد**

بڕوانە: نظامی طنجەءی، هفت پیکر. (ل١٥٠) . وە: کلیات سعدی. (ل٦٨٥). (ئامادەکار)

واتە: هەرگیز خواردنەوەی شەراب ژیریی (عەقڵ) لانەبردووە و لای نابات، چونکە کەسێك کە ژیر بێت ئارەزوی شەراب ناکات، واتە: کە هاتوو خواردیەوە ژیر نیە، کە ژیریش نەبوو ئیتر خواردنەوەی شەراب چی لادەبات؟

هەر لە شیعری نەستەقیەتی ئەم شیعرە فارسیەی کە نیو شیعری یەکەمی هی خۆیەتی و نیو شیعری دووەمی هی (مەسنەوی)یە، بە بۆنەی ڕۆینی مانگی تەموز و هاتنی ئابەوە کە بە پێچەوانە لەو دەمەدا جیهان گەرم بووە، وتویەتی:

**گرمی افزون گشت چون تموز رفت**

**آب آتـــش را مدد شد همچو نفط**(٢)

واتە: کە تەموز ڕۆیی گەرما زۆرتر بوو، ئاب — کە مانگی ئاغستوسە— وەك نەوت بوو بە چاوگی ئاگر.

شیعرەکەی مەسنەوی ئەمەیە:

**از هلـــيله قبـض شد اطلاق رفت**

**آب آتش را مدد شد همچو نفط**(٣)

کە فەرموویەتی لە باسی ئەوەی کە (هەلیلە)ی ڕەش بۆ ڕەوانیی دراوە بە یەکێك، بە پێچەوانە قەبزی کردووە، وەك ئاو کە بکرێت بەسەر ئاگرێکدا بۆ کوژاندنەوە، کەچی بەپێچەوانە وەك نەوت کڵپەی پێ بسێنێت.

لە شیعرەکەی مەسنەوی دا هەر (آب و آتش) هەیە، بەڵام لە شیعرەکەی موفتی دا (تموز و آب و آتش) هەیە، ئینجا (آب) ئەگەر لەگەڵ (تموز) دا بەراوردی دەکەیت بە مەعنا (ئاغستوس)ە(٤)، ئەگەر لەگەڵ (آتش) دا بەرامبەری دەکەیت بە مەعنای (ئاو)ە.

---

(١) ئەم شیعرەم لە مەلا غالبی خانەقینی بیستووە.

(٢) ئەم شیعرەم لە قازی ئەحمەد موختار بیستووە.

(٣) بڕوانە: جلال الدين رومی، مثنوی معنوی. (ب١/ل٥). (ئامادەکار)

(٤) ئاگۆست: مانگی هەشتەمینە لە ڕۆژمێری زاینیدا. (ئامادەکار)

هەر لە شیعری نەستەقیەتی ئەم شیعرە فارسییەی:

**آنکه ادنی است طالب دنیا است**

**زانکه دنیا مؤنث ادنـــی است**(۱)

واتە: هەرکەسێك پەست پایە نەبێت دوای دونیا ناکەوێت، چونکە (دنیا) موئەنەسی (أدنی)یە و هەمیشە پیاوی پەستیش دووی ژنە سۆزانی دەکەوێت.

لە شیعری بە توێکڵیەتی ئەم ڕوباعییە فارسییەی:

**پرســید زمن لطیفە گـــویی**

**پنـداشت کە فارســـــی ندانم**

**گفتا کە بە فارسی ندا چیست**

**گـــــفتم کە بفارسی ندا، نم**(۲)

واتە: لێی پرسیم قسەخۆشێکی نوکتەباز – وایزانیی کە فارسی نازانم– وتی: بە فارسی (نەدا) چیە؟ وتم: بە فارسی (نەدا) نمە، کە بە کوردی پێی دەڵێن (شەونم).

لە ناوەندی (ندانم) و (ندی، نم)دا جیناس هەیە.

هەر لە شیعری بە توێکڵیەتی ئەم شیعرە فارسییەی کە بە جەمیل صیدقی کوڕی وتووە:

**گر کسی پرسدت کە نشنیی چیست**

**در جـــــوابش بگو کە نشنی، دم**(۳)

---

(۱) ئەم شیعرەم لە مەلا محەمەد سەعیدی کوڕی حاجی مەلا ئەحمەدی دێلێژەیی بیستووە.

(۲) ئەم ڕوباعییە و شیعرەکەی دوای لە پشتی دیوانی (شەوکەت) بە دەست خەتی ئەمینی عەبدوڵڵای عەزیزی فەتاح کۆیی نوسراوە.

(۳) ئەم شیعرەم لە خاڵە سەید ئەحمەدی سەید محەمەد بیستووە، زۆرم تەماشای فەرهەنگی فارسی کردووە، تا ئێستا یەشتا (نشنی)م نەدیووە.

واتە: ئەگەر کەسێك لێی پرسیت کە وتەی (نشنی) چیە؟ لە وەڵامیدا بڵێ: (نشنی) (دم)ە، واتە هەناسە نادەم.

لە (نشی دم) دا لەتافەت هەیە، چونکە هەروەك ئەو مانایەی هەیە، ئەم مانایەش دەگەیەنێت: (کە نەمبیستووە).

هەر لە شیعری بە توێکڵیەتی ئەم شیعرە عەرەبییەی کە دەربارەی قازییەکی شەلی نەخوێندەواری وتووە، کە ناوی عەبباس و لە بەغداد بووە:

**لإن عرج الأقران شامخ منـزل**

**لأقســـم يا عباس أنك أعرج**(١)

یەعنی: ئەگەر هەموو هاوشانەکانت سەرکەوتبن بۆ سەرپایەی هەرەبەرز، سوێند دەخۆم ئەی (عەبباس) کە تۆ زیاتر بەرەوژوور بوویتەوە یاخو تۆ شەلیت. کەوابوو لە (أعرج) دا لەتافەت هەیە.

هەر لە شیعری بە توێکڵیەتی ئەم شیعرە کوردییەی:

**ئـــەم (مم)ە خاتری خستومە خەیاڵ و خەتەرە**

**کە بە دیققەت نەزەریشی دەکەمێ (مەمنوعە)**(٢)

واتە: وتەی (مم) —کە لە کتێبە کۆنە دەستخەتەکاندا نوسراوە— دڵی خستمە خرتەخرت، چونکە نەمزانی مانای چیە، کەچی کە لێی ورد دەبمەوە، دەبینم وتەی (مەمنوع)ە، وە لەبەر کورتی وا نوسراوە.

ئەم شیعرە لەگەڵ ئەم مانایەدا، ئەمەش دەگەیەنێت (مم) کە مەمکی دڵبەرە، بە جوانی و خڕ و پڕیی خۆی دڵی خستمە گورپە گورپ، کەچی کە تەماشای ئەکەم (مەمنوع)ە، واتە دروست نیە تەماشاکردن و دەست بۆ بردنی.

---

(١) ئەم شعرەم لە ئەمجەد ئەفەندی زەهاوی بیستووە.

(٢) ئەم شعرەم لە مەلا محەمەدی چرۆستانی بیستووە.

# شیعری لاواندنەوەی

لە شیعری لاواندنەوە (رثاء)یەتی ئەم قەصیدە عەرەبییەی دوایی کە بە بۆنەی مردنی (مەلا سولەیمانی خضری)یەوە[1] وتوویەتی و لە ساڵی (١٢٦٠ك) لە بەغدادەوە ناردوویەتی بۆ مەلا عەبدوڵڵای کوڕی لە کەرکوك و ئەمیش لەو ساڵەدا بە خەتی خۆی لە پشتی (مطوّل)ێکی دەستخەت نوسیویەتی –کە ئەو مطوّلە ئێستا لای مەلا عبدالرەحمانی کوڕی مەلا عەلی حیکمەت ئەفەندییە لە کەرکوك.

لە پێش قەصیدەکەوە مەلا عەبدوڵڵا دەڵێت: (من بنات أفكار الفاضل اللوزعي محمد أفندي الزهاوي المدرس ببغداد –مدّ ظله– في مرثية والدي المرحوم الملا سليمان المتوفى سنة ألف ومائتين وستين، رحمه الله). لە دوای قەصیدەکەشەوە نوسیویەتی: (حرّر بقلم الحقير الأثيم عبدالله الخضري المدرس بقورية/ كركوك/سنة ١٢٦٠هـ):

ألا إنمـــا الدنياسجيتها الغدر
فليس لمغرور بزخرفها عــذرُ[2]

فظاهرها ودٌّ وباطنــها قـــلى
وإدبـــارها خيرٌ وإقبالها شرٌّ[3]

ورغبتهــــا غيٌّ ورهبتها هدىً
وطـــــالبها عبد وهاربها حرٌّ[1]

---

(١) (خضر) ناوی دێیەکە لە ناوچەی (سەنگاو) لە قەزای (چەمچەماڵ).

(٢) واتە: بزانن کە پیشەی جیهان هەر زۆرو ستەمە، کەوابوو ڕەوانیە بۆ کەس کە بە جوانیی ئەو هەڵبخەڵەتێت.

(٣) واتە: جیهان بە دیمەن خۆشەویستی ئەنوێنێت، بەڵام وەکیتر پڕە لە کینە و قین، پشتهەڵکردنی لە مرۆڤ چاکە و ڕووکردنی خراپە.

وعـــــزتها ذلّ وفرحـــــتها أسىً
وصـــــــحتها ســقم وثروتها فقرُ[٢]

وإن سالمت لا يسلم الناس بأسها
تزور بأحيـــــان وفي الحال تَزْوَرُّ[٣]

تُوالى وتُولى النيـــــل ظهراً وبعده
تعود تُعادي قبل أن يأتي العصر[٤]

هـــــواها سبي الألباب وهي قبيحة
نعم مـــا لها حسنٌ ولكن لها سِحْرُ[٥]

مـــــع القبح عمر الخاطبين صداقها
فما هي بالحسنا ولم يغلها المهرُ[٦]

مـــكارهها أضعاف مـــا يُشتهى بها
فضُعف الـــقوى نفع وقوتها ضرٌّ[١]

---

(١) واتە: خۆشەویستی جیهان سەرلێشێوانە و ئارەزوونەکردنی قازانجە، ئەوی دووی کەوێت بەندەیەتی و ئەوی لێی ڕاکات ئازاد و سەربەستە.

(٢) گەورەیی لە جیهاندا ڕیسواییە و کەیفخۆشی لەوا خەم و خەفەتە و ساغێتی نەخۆشییە و بوونی نەبوونییە.

(٣) ئەگەر هێمنیش بنوێنێ کەسێ لە زیانی ڕزگار نابێت، جار جارە سەرت لێ دەدات و کتوپڕ پشتت تێ دەکات.

(٤) یەك لە داوی یەك بۆ لات دێت و لە نیوەڕۆدا بە ئاواتت دەگەیەنێت، کەچی لە پێش عەسردا دەگەڕێتەوە سەرت بە دوژمنایەتی.

(٥) ئارەزووی جیهان –بەم هەمووو ناشیرینیەشەوە کە هەیەتی– دڵی هەموو کەسێکدەفڕێنێت، بەڵێ هیچ جوان نیە، بەڵام جادووگەرە.

(٦) لەگەڵ ئەو هەموو ناشیرینییەدا کە هەیەتی گیانی خوازبێنییکەران مارەییەتی، هەرچەن جوانیش نیە کەچی ئەم مارەییە بەزۆر نازانێت.

فمحسوسها في الباطن الجوع والظمى
وملـــموسها في الظاهر البرد والحرُّ[2]

ســـــــمعنا بـــأن الحق مرّ مذاقه
وعيــش الـــدنا مــع أنه باطل مرُّ[3]

ومـــــشمومها نتن وبشع مذوقها
ومُبْصرها نكر ومسموعها هجرُ[4]

ونشـــــكو بما ليست بدار قرارنا
قـــــرارة أكدار فشكوتنا شكرُ[5]

فأســـــعدْ بمن عنها ترحل سالفاً
من الباقيات الصالحات لها ذخرُ[6]

وبدل بـــــــــالفاني المخلَّدَ باقياً
لـه آجلا أجر وفي العاجــل الذكرُ[1]

---

(١) ناخۆشی جیهان سەد چەندانەی خۆشییەتی، لاوازیی و بێ هێزی لەودا قازانجە و بەهێزیی و تەوانایی تیایا زیانە.

(٢) ئەوی لە جیهانەوە بە دەروونمان دەگات هەر برسێتی و تینوێتیە، ئەوی دووچاری دەبین تیایا بە دیمەن هەر سەرما و گەرمایە.

(٣) ئاشکرایە شتی ڕاست و حەق تاڵە (واتە: دەبێت شتی ناحەق شیرین بێت)، کەچی ژینی جیهان لەگەڵ ئەمەشدا کە ناحەقە هەر تاڵە.

(٤) بۆنی هەر بۆگەن و تامی تاڵ و بینراوی ناشرین و بیستراوی پڕو پوچە.

(٥) سکالاّمان لەدەست نەمانەوەمانە لە جیهاندا، بەڵام چونکە جێگای خەم و خەفەتە سکالاّکە سوپاس دەگرێتەوە.

(٦) چەند بەختیارە ئەو کەسەی کە لە جیهان کۆچی کردبێت و لە پێش خۆیدا تێشووی باشی ڕەوانە کردبێت.

كما ارتحل المولى سليمان ذلك الـ
تّقيّ النقي الـــزاهد العابد البَرُّ[٢]

بطـــول بقاه لم يُقصر مـــن التقى
تقوم ليـــــــاليه تَصومُ له النُّهْرُ[٣]

ويشتاق أن لا تغرب الشمس صائما
ويَكـــره في الإحياء أن يطلع الفجرُ[٤]

وأعـــــــلى قصور الخلد أولى بمؤمن
له طال في التقوى وفي الطاعة العمر[٥]

لبطـــن الثرى فخر على ظهره بما
غدى ثـــاويا في بطنه ذلك الصدر[٦]

ورق لـــــــــه حزنا فلو كان ناطقا
رثاه بما لـم يُرث صخرٌ به الصخرُ[١]

---

(١) جیهانی ناپایەداری گۆڕپیبێتەوە بە دواڕۆژی جاویدانی، ئەو کەسە لەو جیهاندا پاداشتی باش و لەم جیهانەدا ناوێکی پاکی هەیە.

(٢) هەروەك كۆچی كرد گەورەمان (مەلا سولەیمانی خدریی) ئەو پیاوەی كەوا بە پارێز و پاك و گۆشەگیر و خواپەرست و چاكە.

(٣) بە درێژایی ژیانی درێغی نەكرد لە پارێزگاری لە خراپە، شەو بێدار و ڕۆژ بەڕۆژوو بوو.

(٤) ئارەزووی دەكرد كە ڕۆژ هەر ئاوا نەبێت و بەڕۆژوو بێت، لە شەو بێداریشدا پێی خۆش نەبوو ڕۆژ بێتەوە، تا هەر شەونوێژ بكات.

(٥) بەرزترین كۆشكی بەهەشت بۆ موسڵمانێكە كە ژیانی درێژی خۆی بردبێت لە خواپەرستیی و پارێزگارییدا.

(٦) بۆ ژێر زەوی هەیە كە بنازێت بەسەر زەوییدا بەهۆی ئەو پایە بەرزەوە كە چووەتە باوەشیەوە.

وفـى لــــي البكاء في رزئه وأمدّني

لــيالي لم يُنصر ولم يصبر الصبرُ[٢]

ولـــو لم يخنّي الصبر مت خجالة

فخذلان صبري في مصيبته نصرُ[٣]

خـــــليليَّ هل قام القيامة؟ أنني

يـــــخيّل لي أن السماء بها فطرُ[٤]

وأن ضيــاء الشمس في قلبها لظىً

وأن نجـــوم الزهر في كبدها جمرُ[٥]

فــجائت بدخان له الشمس كُوِّرَتْ

كما انكدرت فيها به الأنجم الزهرُ[٦]

وأن ســــــكون الأرض نابتة رجفة

وأن الجبـــــال الراسيات لها مرُّ[١]

---

(١) له خەفەتی مردنیا بەرد بە جۆرێك نەرم بووە، ئەگەر زمانی ببوایە وای بۆ ئەلاواندەوە كە (خەنساء) بۆ (صەخر)ی برای نەلاواندبێتەوە.

(٢) له مردنی ئەودا گریان دەستی گرتم و یارمەتی دام لەو شەوانەدا كە یارمەتی تیانادرێت و ئارام خۆی تیا بیّ ئارامە.

(٣) ئەگەر ئارام ناپاكی لەگەڵدا نەكردمایە و یارمەتی نەدامایە له تەریقیا دەمردم، ئەمەی كە لەشكری ئارام بشكێت و نەتوانێت من له خەم و خەفەتی ئەو سارد بكاتەوە ئەوە بۆ من بە مەرام گەیشتنە. (چونكە من دەمەوێت له خەفەتیا بمرم).

(٤) ئەی دوو خۆشەویستەكەم! ئایا ئەمە ڕۆژی دواییە هەستاوە كەوا من وا تێدەگەم كە ئاسمان لەت بووە.

(٥) له ناو دڵی ڕۆژ بڵێسەی سەندووە و ناو جەرگی ئەستێرە گەشەكان پڕ بووە له پشكۆ؟

(٦) ئاسمانیش دوكەڵێكی پەیداكرد بەری ڕۆژی گرت، هەروەك ئەستێرە گەشەكانیش ڕووناكییان نەما.

وإن بكت الأرض الســـما في بكاهما
فــأعينـــها تجري وأدمعه قطر[٢]

وعـــــاد غزير الدمع منادمـــا نعم
إلى النار يوم الحشر ينقلب البحر[٣]

لإن فات وهو الورد فابناه سلما
لنا ماء ذاك الورد بعده والعطر[٤]

أُعيـــــــذهما أن يجزعا لوفاته
فبالصبر في القرآن قد عُلّق الأجر[٥]

ســـقت رحمة الرحمن قبره دائما
وآنســـــه في لحده العفو والغفرُ[٦]

---

(١) زەوی ئارامی لەبەر بڕاو کەوتە جوڵە جولّ و شاخەکان –کە لەنگەری زەویین– بوون بە تۆز و کەوتنە ئاسمان.

(٢) ئەگەر ئاسمان و زەوی بۆ مردنی یەکێك بگریانایە، ئەمانوت لە بابەت گریانەکەیانەوە، فرمێسکی ئەمیان کانیی و سەرچاوەکان و هی ئەویان بارانەکەیەتی.

(٣) ئەوەندەی بۆ گریاین فرمێسکمان بوو بە خوێن، بەڵێ وایە، ئاوی دەریاکانیش لە ڕۆژی دواییدا دەچنەوە ناو دۆزەخ و دەبن بە بڵێسەی ئاگر.

(٤) هەرچەند ئەو گوڵە هەڵوەری و نەما، بەڵام خوا هەردوو کوڕەکەی خۆشبکات، لە دوای ئەو گوڵە ئەم گوڵاوە بۆنخۆشانە بۆ ئێمەن.

(٥) ئامۆژگارییان دەکەم کە بۆ مردنی باوکیان زۆر بە پەرۆش نەبن، چونکە لە قورئاندا پاداشتی دوارۆژ بە ئارام و خۆڕاگرتنەوە بەستراوە.

(٦) میهرەبانی خوا هەمیشە گۆڕەکەی ئاوداشتە بکات و لێبوردنی خودا ببێت بە هاودەمی ناو گۆڕی.

هەر لە لاواندنەوەیەتی ئەم شیعرە عەرەبییەی کە بە بۆنەی مردنی (نەجمەددین) ناوێکەوە وتوویەتی کە لە بەغداد (نائیبی قازی) و پیاوێکی زۆر باش بووە:

**نجم سعدٍ كان فينا أفلا**

**أفلا نبكي عليه أفلا**[١]

واتە: ئەم نەجمەددینە ئەستێرەیەکی بەختیاریی بوو ئاوابوو لەناوماندا، ئایا بەسەریا نەگریین؟ واتە: با بگریین بۆی.

لە ناوەندی هەردوو (أفلا)دا جیناس هەیە.

---

(١) ئەم شیعرەم لە مەلا غالبی خانەقینی بیستووە.

# شیعری بەباڵابڕینی - تەقریز-

موفتی کە زانایەکی دانای بەناوبانگ و پێشەوایەکی گەورەی پایەبەرز و شاعیرێکی زۆر ڕەوان بووە، هەرکەسێك خۆی ناسیبێت و شتێکی جوانی نوسیبێت، بۆی بردووە کە تەقریزی بکات، ئەمیش یان بە شیعر یان بە نەسر[1]، یان بە هەردووکیان تەقریزی کردووە.

لە تەقریزی چامە (قەصیدە)یەکی (رائیە)ی (عبدالباقی عومەریی)دا کە هەر خۆی تەخمیسی کردووە، ئەمە یەکەم شیعرەکەیەتی[2]:

قــدح الوجد زنده فــــــأطارا

من حصاة القلب الشجيِّ شرارا

حـــــــينما ناظر المعنى جهارا

شـــام برقا من الشآم استنارا

مــــــلأ الخافقين نورا ونـــارا

موفتی چامەیەکی (رائیە)ی هەر لەو وەزنە وتووە، کە لەناو دیوانەکەی (عبدالباقی)دا چاپکراوە، دەڵێت[3]:

---

(١) نەسر (نثر) واتە: پەخشان. کە بریتییە لە نوسینێك بە هۆنراوە نەنوسرابێت و وەزن و قافیەی تێدانەبێت. (ئامادەکار)

(٢) بۆ تەواوی قەصیدەکە بڕوانە: (الترياق الفاروقي أو ديوان عبدالباقي العمري). ل١٦٣.

عبدالباقی عومەریی لە سەرەتای ئەم قەصیدەیەدا نوسیویەتی کەوا ئەم قەصیدەیەی لە ستایشی (الشيخ الأكبر محي الدين ابن عربي)دا نوسیوە. (ئامادەکار)

(٣) بڕوانە: (الترياق الفاروقي أو ديوان عبدالباقي العمري). ل١٨٢.(ئامادەکار)

إن هذي قـــصيدة لا توارى
انبرت للورى وليست تبارى[١]

بـــدرة التبر تـــلك أم بـــدرتم؟
طلعت من دار الســلام بدارا[٢]

هـــي رائيـــة عـلى الألف الــرا
ء بـها قدمت فـــحازت فخـارا[٣]

رأوا الرا لـــها تـــصير رؤيـــا
ولذا اســتحسنوا لها التكرارا[٤]

واصـــل لو هداه فهم لما صـا
غ لمنطوقه سوى (را) سوارا[٥]

أخــــــرت عن قصائد سبقتها
كـــــن ليلا لها وكانت نهـــارا[٦]

---

(١) ئەم چامەیە لەبەر جوانیی خۆی ون نابێت، دەرکەوتووە بۆ عالەم و هەرگیز ملەملەی لەگەڵدا ناکرێت.

(٢) کیسە زێڕێکە بۆ خۆی؟ یان مانگی چواردەیە؟ کە هەڵهاتووە لە بەغدادەوە.

(٣) ئەم چامەیە دوایەکانی هەموو (راء)ن کە لە (ئەلیف) پێش خراوە و بووە بە مایەی شانازیی خاوەنی.

(٤) خەڵکی کە بینینان دوایی ئەم چامەیە (را) یە، لەبەر ئەمە ئەوانیش بەجوانیان زانیوە وتنی چامەی وا کە دوایەکەی (راء) بێت. (کە یەکێك لەوان موفتی خۆیەتی کە ئەم چامەیەی وتووە).

(٥) (واصل)ی کوڕی (عەتا) –کە زبانی بۆ (راء) لەبار نەبووە– ئەگەر ئەم چامەیەی ببینیایە لەناو هەموو پیتێکدا هەر پیتی (راء)ی هەڵدەبژارد و دەیکرد بە بازنی دەستی.

(٦) ئەم چامەی (عبدالباقی)یە دوای هەموو چامەکانی تری وتراوە، ئەوان بوون بە شەوی ئەم و ئەم بوو بە ڕۆژیان.

**وبـــهــــا لا يقاس شـــعر وسحر**
**مَن بصوت الزبور قاسى الخوارا**(1)

**تترامــى بالخفض من فوق شعري**
**هـــــو والشـعريان قد تتمارى**(2)

**صيرت معشرا رأوها من اللفـ**
**ظ سكارى وبالمعاني حيارى**(3)

**مــــا يقول المقرظون حريّا**
**ما يقول المحيرون السكارى**(4)

**أشبهت في فصاحة أفصح الكتـ**
**ب فجلت أن تشبه الأشعارا**(5)

**تلك إرث الفاروق من نـزل الفر**
**قان طبق الذي تلاه مرارا**(6)

---

(١) ئەم چامەیە ئەوەندە بەرزە نەوعی شیعر و جادویش نیە، کێ دەنگی زەبووری داود و گوێرەکە بەیەك دەشوبهێنێت؟

(٢) ئەو کەسەی کە پایەی شیعری لە ژوور (گەلاوێژ)ەوەیە لە چاو بەرزیی ئەم چامەیەدا پەست دەنوێنێت، ئەویش و ئەستێرەی (عەبور) و (غومەیصاء)یش کە پێیان دەڵێن (شیعرەیان) لە بازاڕی ئەم چامەیەدا خۆیان دەشارنەوە.

(٣) ئەو کەسانەی کە ئەم چامەیەیان بینیوە، بە وتەکانی سەرخۆش و بە مەبەستەکانی سەرسام بوون.

(٤) ئەو تەقریزەی کەوا تەقریزکەر بە شایستەی دەبینێت بۆ ئەم چامەیە، لە چاو بەرزیی ئەما وەك وتەی سەرخۆش وایە.

(٥) ئەم چامەیە لە فەساحەتدا لە قورئان دەچێت، کەوابوو بەرزترە لەوەی کە بە شیعر ناو ببرێت.

(٦) ئەم فەساحەت و بەرزیی گوفتارە لە باپیرە گەورەیەوە بۆی ماوەتەوە کە حەزرەتی عومەرە، کە زۆر ئایەتی قورئان بە ڕێکی بیری ئەو هاتووەتە خوارەوە.

صــاغ عبدالـــباقي الزكي السـ
ري الـــعمري المنحة الأفكـــارا(١)

يا هُزيرا بغابة الشـــعر لـــو با
رز أسدا مـــضوا لـــولـوا فرارا(٢)

في زلال الألـــفاظ شُـــهبَ المعاني
صغتَ من صاغ قبل في الماء نارا(٣)

يـــا لها من قصيدة صِدت فيها !
فــكرا كالـــعنقا خِفا ونفـــارا(٤)

ثـم خمســـتها بـــطرز بديـــع
فقرنت النجـــوم والأقـــمارا(٥)

كـل تخميس كـــل بيت خميسٌ
يُهزم الشـــاعرين والأشـــعارا(٦)

أوجـــز المفلقون قبلك لـــــكن
عـــجزوا عن مدى تجـوز اقتدارا(١)

---

(١) (عبدالباقى) زيرەكى گەورە بەهرەی خۆی دارِشتووە لە قالْبی ئەفكار و بیردا.

(٢) ئەی شێری بێشەی شیعر! ئەگەر ملەملە بكەیت لەگەڵ ئەو شاعیرانەی كە وەك شێر وانە، هەموو پشت هەڵدەكەن و هەڵدێن.

(٣) بلێسەی مەعنات دارِشتووە لە ئاوی ڕوونی وتاردا، تا ئێستا كێ ئاگری دارِشتووە لە قالْبی ئاودا؟

(٤) ئای ئەمە چ چامەیەكە كەوا لە ناویدا ڕاوت كردووە چەند بیرێكی بەرزی وەك عەنقا لە نادیاریی و سڵ كردندا!

(٥) لە پاشا كردووتە بە پێنج خشتەكی بە وێنەیەكی جوانی وا كە مانگ و ئەستێرەت بەرامبەری یەك تیا ڕاگرتووە.

(٦) پێنج خشتەكی هەموو شیعرێكی لەشكرێكە هەموو شاعیر و شیعرێك دەشكێنێت.

أنـــت في ذرة تقرّ شموســــــا
أنت في قـــطرة تصب بـــحارا[٢]

فـــكثير التحســـين يبدو قليلا
وطويل التقريظ يلفى اختـــصارا[٣]

دم لنــــا باقيا بـــــعيش هني
ووقيتَ الأقدار والأكـــــــــدارا[٤]

دوم رائيـــــة الدهـــور وتخميـ
ـس فروض الصلاة تتلى كـــرارا[٥]

هەروەها لە تەقریزی تەفسیری (روح المعانی) ی سەید مەحمودی ئالوسی دا دەڵێت:

ألا إن مـــولانا الشهاب أبي الثنا
ء محمود أهل العصر أشرفهم قدرا[٦]

---

(١) شاعیرە بەرزەکانی پێش تۆ نوکتە بازییان کردووە، بەڵام نەك بە ئەندازەیەك کە لە دەستەڵات بەدەربێت.

(٢) تۆ دەتوانیت چەند ڕۆژێك جێ بکەیتەوە لەناو شتێکی زۆر بچووکدا و چەند دەریایەك بخەیتە ناو دڵۆپێکەوە.

(٣) کەوابوو ستایشی زۆرت کەم دەنوێنێت و تەقریزی درێژیش بۆ تۆ کورت دەردەچێت.

(٤) هەر بژیت بۆ ئێمە بە ژینێکی خۆشی ئێجگاریی و یاخوا لە هەموو چەپاڵەیەك بەدوور بیت.

(٥) بە درێژایی ئەمەی کە وتەی (دەهر) ڕائی ببێت، واتە: (راء)ی تیا بێت و تا پێنج فەرزەی نوێژ بکرێت و بکرێتەوە تۆ هەر بۆمان بمێنیت.

(٦) بزانە کە گەورەمان (شهاب)ی مەشهور بە (أبي الثناء) کە ناوی (مەحمود)ە و ستایش کراوی ئەهلی زەمانی خۆیەتی، پایە بەرزتری هەموویانە.

وأنـــقدهم طبعـــا وأوقدهم ذكـــا
وأثقبهم ذهنـــا وأصوبهـــم فـــكرا[١]

ومـا كنت أدري قبل علـمي بفضلـه
بـأن لهـذا الدين في عـــصرنا حـــبرا[٢]

تـــحققت بحـــــرا قلبه بعـد خبرتي
ومـــن يختبر حبرا يجـــد قلبه بحرا[٣]

وشـــــاهدت آيات شـــــــهدن بفضله
و (روح المعاني) بينه الآية الـكبرى[٤]

لإن كـــــــان في التفسير قصدُ مؤلف
فـــقد حققت فيه العلوم كما يحرى[٥]

يكـــــــون حيـاة الناس بالروح عادة
ومن عجب موت الأعادي بها حسرا[٦]

---

(١) تەبیعەت ڕەوانتر و زیرەکتریانە و بیر تیژتر و فیکر دروستتریانە.

(٢) تا ئەوم نەناسی بوو نەم ئەزانی کە ئەمڕۆ بۆ ئەم ئایینە زانایەکی پایە بەرزی وا هەیە.

(٣) لە پاش بەراورد بۆم دەرکەوت کە دڵی وەك دەریا وایە، کەسێکیش بەراوردی زانای وا بکات، تێ دەگات کە دڵی وەك دەریا وایە.

لە ناوەندی (حبر) و (بحر)دا (جیناس) هەیە.

(٤) چەند نیشانەیەکم دی کە گەواه (شاهید)ن لەسەر گەورەیی و پایەبەرزیی ئەو، بەڵام تەفسیری (روح المعاني) نیشانەی هەرە گەورەیانە.

(٥) هەرچەند موئەلیف لەم تەفسیرەدا بە کورتی دوواوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەموو عیلمێکی بە پوختی تیا باس کراوە.

(٦) بەپێی عادەت و باو ژیانی مرۆڤ بەگیانە، زۆر سەیرە کە دوژمنانت بەم گیانە کە (روح المعاني) یە مردوون لە داخا.

فبشــراك مولانا لقد صرت حـــــائزا

لذكرك في الــدنيا وأجرك في الأخرى[(١)]

فما منصـــــف إلا ويشكر سعيكم

فيمدحكـــــم جهرا ويدعولكم سرا[(٢)]

ولا تخش فقد العيش بعـــد فكل مَن

يدوم له (روح) يعيش به الدهـــرا[(٣)]

(١) موژدەبێت ئەی گەورەمان! کە ناوت دەرکرد لە جیهاندا و بویت بە خاوەن پاداشت لەو دنیاشدا.

(٢) هەموو کەسێکی بە ئینصاف ستایشتان دەکات لەسەر ئەو ڕەنجەی کە داوتانە و بە ئاشکرا سوپاستان دەکەن و بە پەنهانی نـزای چاکتان بۆ دەکەن.

(٣) ئیتر مەترسن لە مردن، چونکە هەر کەسێك گیانێکی وەك (روح المعاني) ببێت تا دنیا دنیا بێت پێی ئەژی و نامرێت.

# شیعری زەمی[(١)]

دەگێڕنەوە کە قازییەکی پیری نەخوێندەوار لە ئەستەمبوڵەوە دەنێرن بۆ بەغداد، لەبەر نەخوێندەواریی خۆی زۆر ڕقی لە موفتی بووە، هەمیشە لە کەمینیا بووە، موفتیش بەم بۆنەیەوە ئەم ڕوباعیە فارسیەی لە زەمیا وتووە:

**مرگ قاضی نه ازان داشت اجل در تأجیل**
**وهـــم آید که قضارا شده در وی تعطیل**

**بسکه در تیه ضلالت به جهالت شده غرق**
**که به صد سال برو پی نبرد عزرائیـــل[(٢)]**

واتە: دواکەوتنی مردنی قازی لەبەر ئەوە نیە کە ئەجەلی نەهاتبێت، بەڵکو وا گومان دەبرێت کە قەزا و قەدەر لەودا داماوە، لەبەر ئەمە کە ئەوەندە لە چاڵی گومڕاهی دا نوقوم بووە، بە سەد ساڵ عیزرائیل نایدۆزێتەوە کە گیانی بکێشێت!.

هەر لە زەمیەتی ئەم ڕوباعیە عەرەبیەی کە دەربارەی زانای بەناوبانگ (نەصیری تووسی) خاوەنی (تەجرید) وتووە، بەهۆی ئەمەی کە لە دوای ئەم کتێبەیەوە ڕەگی شیعەیەتی هاتووەتە جۆش و چەند نەنگێکی بێ ڕێ و جێی لە حەزرەتی (ئەبوبەکر) و (عومەر) و (عوسمان) گرتووە:

**يا جامعاً بالسوء حُسنَ كتابه**
**هلّا خشيتَ عليك سوء الخاتمة**

**جمعَ النصيرُ الحسنَ في تجريده**
**لــكنه بالسوء أمسى خاتمه[(١)]**

---

(١) واتە: شیعری توانج و پلاری. (ئامادەکار)

(٢) ئەم ڕوباعییەم لە مەلا غالبی خانەقینی بیستووە و لە پشتی تەهزیبەکەی شێخ عەلی قەرەداغیشدا نوسراوە.

واتە: ئەی ئەو کەسەی کە کۆت کردووەتەوە لەگەڵ جوانی کتێبەکەتدا خراپیی، تۆ هیچ نەترسایت لە سەرەمەرگتدا بەبێ ئیمانی بڕۆی؟ (نەصیری تووسی) جوانی و ڕەنگینیی کۆکردووەتەوە لە کتێبەکەیدا کە (تەجریدە)، بەڵام دوایی خۆی یان کتێبەکەی بە خراپە گەڕا.

هەر لە زەمیەتی ئەم ڕوباعیە کوردیەی کە دەربارەی یەکێکی حیز وتویەتی:

**بۆ خــۆی موقەددیم تالیبان تـالی**
**ڕەفع و وەزعیان لە ئینتاج خـالّی**

**گەر ئەڵێی چییە ئەو کێرە سیسە؟**
**پێی باوەڕ مەکە ئەلفی تەئنیسە(٢)**

لەم ڕوباعیەدا پێنج ئیستیلاحی عیلمی مەنتیق و ئیستیلاحێکی عیلمی نەحوی تێدایە: (موقەددیم، تالی، رافیعە، وازیعە، نەتیجە، ئەلفی تەئنیس).

هەر لە زەمیەتی ئەم شیعرە فارسیەی کە دەربارەی ئەو ناوەجاخانەی وتووە کە خۆیان بادەدەن بە کاڵایەکی ئاوریشمینەوە و پێی دەنازن بەسەر خەڵکیدا:

**فرومایه چنــان با جامهء ابریشمـــی نازد**
**تو می گویی به بردارد مقامات حریری را(٣)**

واتە: پیاوی بێ مایە وا خۆی با ئەدا و دەعیە و دەمار دەکات بەسەر خەڵکیدا بە پارچە کاڵایەکی ئاوریشمینەوە، دەڵێی (مەقاماتی حەریریی) لەبەرە.

(مەقاماتی حەریریی) کتێبێکی زۆر جوانی پڕ لە (سەجع) و (قافیە)یە، وەك قاموسێکی عەرەبی شیعر وایە، جاران زۆر باو بووە لەناو خوێندەواران و شاعیراندا لەبەرکردنی.

---

(١) ئەم ڕوباعییەم لە مەلا غالبی خانەقینی و مەلا عارفی ئەمینی وەسمان بیستووە.

(٢) ئەم ڕوباعییەم لە مەرحوم عبدالعزیز ئەفەندی موفتی سلێمانی بیستووە.

(٣) ئەم شیعرەم لە مەلا غالبی خانەقینی بیستووە.

چەن جوانە؟! لەو شیعرەدا کۆکردنەوە و بەراوردکردنی کاڵای ئاوریشمین لەگەڵ (مەقاماتی حەریری) کە (حەریر)یش بە عەرەبی ئاوریشمە!! چەند جوانە لەگەڵ لەبەرکردنی ئاوریشمدا، لەبەرکردنیشی بەکارهێناوە بۆ (مەقاماتی حەریری) کە لە مانادا غەیری لەبەرکردنی پێشووە!!.

لە زبانی موفتییەوە دەگێڕنەوە کە شێخ ڕەسوڵ ناوێك بووە لە سلێمانی، هەمیشە کتێبێکی (شەرحی طوالع)ی لە بن دەستابووە، بە هەر مەلایەك گەیشتبێت سوئالێکی لێکردووە، ڕۆژێکی هەینی (جومعە) لە مزگەوتی گەورە دەست دەکات بە سوئال کردن لە زەهاوی، ئەمیش یەك لە دوای یەك وەڵامی دەداتەوە، لە پاشا ئەمیش سوئالێك لەو دەکات و پەکی دەکەوێت، ئینجا بەم بۆنەیەوە موفتی ئەم شیعرە فارسیەی لە ڕووی گاڵتەپێکردنیەوە دەڵێت کە دواییەکەی کوردیە:

**شــرح طوالع در بغـل با خـــلق میســـــازد جـــدل**

**چون خر بماند در وحل ئوزونەینی بگرە و باری کە**[1]

واتە: هەمیشە شێخ ڕەسوڵ (شەرحی طوالع)ێکی لەبن دەستایە و موجادەلەی پێ دەگرێت لەگەڵ خەڵکدا، کەچی کە خۆی سوئالێکیشی لێ بکرێت وەك کەر لە قوڕدا دەچەقێت و ئیتر هەردوو گوێی بگرە و باری کە.

شێخ ڕەسوڵ بەمە زۆر تەریق دەبێتەوە، بە گریانەوە دەچێتە سەر سلێمان پاشای بەبە، پاشاش خێرا دەنێرێ بە شوێن زەهاوی دا بۆ ئەوەی کە سزایەکی بدات، کە زەهاوی دەچێت بۆلای، دەبینێت وا پاشا لەگەڵ (شێخ لەتیفی)[2] گەورەدا وەستاوە

(١) ئەم شیعرەم لە مەلا غالبی خانەقینی بیستووە.

(٢) ئەم شێخ لەتیفە ئەو کەسەیە کە لەگەڵ مەولانا خالیدی نەقشبەندی دا فەقێ بووە و ڕۆژێك مەولانا لە یاری (گۆێن)دا ناوچەوانی شکاندووە، و بەم بۆنەیەوە غەزەلێکی فارسی زۆر جوانی لە دڵنەوایی شێخ لەتیفدا وتووە، کە یەکەم شیعرەکەی ئەمەیە:

**بە چوگان قضا بادا شکستە دست و چوگانم**

**کــە برهـــم زد هلال ابروی آن ماە تابـــانم**

و ئەوەندە ڕقی هەستاوە نەبێتەوە، بەڵام شێخ لەتیف نایەڵێت پاشا بێتە قسە، خێرا قسەیەك بە گوێچکەیدا دەچرپێنێت و ساردی دەکاتەوە، ئینجا پاشا نەختێك بەسەر زەهاویدا دێت و ئامۆژگاریی دەکات و بەم بۆنەیەوە زەهاوی دەناسێت.

لە پاش بەینێك سولەیمان پاشا دەنێرێت بە شوێن زەهاویدا کە بە ڕۆژ بچێتە ماڵەوە بۆلای و دەرسی (مەسنەوی) پێ بڵێت، لە پاش چەند مانگێك خوێندن ڕۆژێك پاشا پێی دەڵێت ئەمڕۆ دەرسەکەم ساغ کردووەتەوە، زەهاویش دەڵێت پاشا! بەخوا هیچت لێ نەزانیوە. پاشا کە دەست دەکات بە مانا لێکدانەوەی شیعرەکان هەرچی ئەو دەیڵێت ئەم ڕەددی دەکاتەوە و خۆی مانایەکی جوانی لێ دەداتەوە. لە پاشان سلێمان پاشا دەڵێت: هەزار ئافەرین بۆ شێخ لەتیف کە ئەو ڕۆژە منی سارد کردەوە بەرامبەر بە تۆ، دەزانیت چی پێ وتم؟ وتی: بۆ شێخ ڕەسوڵێکی نەخوێندەوار نیازت هەیە ئەم پارچە گەوهەرە لەناوبەریت؟ ئینجا دەڵێن هەرچەند زەهاوی ئەم داستانەی گێڕاوەتەوە ڕەحمەتی بۆ شێخ لەتیف ناردووە.

---

(بۆ تەواوی قەصیدەکەی مەولانا خالید بڕوانە: مەلا عبدالکریمی مودەڕڕیس، یادی مەردان. (ب١/ل٥٥٠). (ئامادەکار).)

# شیعری مەتەڵی

لە مەتەڵی موفتیە ئەم شیعرە فارسیەی:

**از بیست چهار صدش بدر کن**

**عکسش بر من فرست چندی**(۱)

یەعنی: لە بیست چوارسەدی لێ دەربکە، چەند دانەیەکم لە پێچەوانەی باقیەکەی بۆ بنێرە.

واتە: وتەی (بیست) کە چوار پیتە، تائەکەی کە بە حسابی ئەبجەد چوارسەدە لێی فڕێ بدە، پیتەکانی تری پێچەوانە بکەرەوە دەبێت بە (سیب)ی فارسی کە بە کوردی (سێو)ە. واتە: چەند دانەیەکم سێو بۆ بنێرە.

هەر لە مەتەڵیەتی ئەم شیعرە عەرەبیەی:

**جعلتُ قولي شرحا لحالي**

**فاحذف اللام تفهم سؤالي**(۲)

تەماشای مانای ئەم شیعرە لە بەشی (قەناعەتی)دا بکە.

---

(۱) ئەم شیعرە لە پشتی تەهزیبەکەی شێخ عەلی قەرەداغی نوسراوە.

(۲) ئەم شیعرەم لە تاهیر عوسمانی کەرکوکی بیستووە.

# شیعری پەڕاگەندەی[١]

موفتی شیعری پەڕاگەندەی ئێجگار زۆرە، کە هەر یەکێك یان دوانیان بە بۆنەی شتێکەوە وتووە، بەڵام ئەوی دەست ئێمە کەوتبێت ئەم چەند شیعرەیەتی:

دەگێڕنەوە: جارێکیان (جەمیل صیدقی) کوڕی لێی دەتۆرێت و بەرێکەوت موفتیش نەخۆش دەکەوێت و زۆر بیری جەمیلی کوڕی دەکات و بەم بۆنەیەوە ئەم دوو شیعرە فارسیەی بەگلەیی بۆ دەنێرێت:

**پدرت زار و نـزارســـــت، ازو**

**نیست انصاف که بیزار شوی**

**او تـرا بهر خود افروخت چرا**

**شمع کاشانەی اغیار شوی[٢]**

واتە: باوکت دەگری و دەناڵێنێت لە دوریت، ڕەوا نیە کە لێی بێزار ببیت، ئەو تۆی بۆ ڕووناکی دڵی خۆی هەڵگیرساند، بۆچی دەبیت بە چرای دیواخانی بێگانان؟

دووبارە دەگێڕنەوە: کەساڵێك ئاوی دیجلە هەڵدەسێت و شاری بەغداد دەکەوێتە سەر ئاو،لەگەڵ ئەوەشدا بایەکی زۆر توند و بەهێز هەڵدەکات، کەس ناتوانێت سەر لە کون دەربهێنێت، جا بەم بۆنەیەوە موفتی ئەم شیعرە فارسیەی وتووە:

**زلزلـە افتاد آن ســـاعت ز بیم**

**زلزلـــة الساعة شـــيء عظيم**

**واهمه می گفت آن ساعت بروح**

**صرصر عادست با طوفان نوح**

---

(١) پەڕاگەندە: وشەیەکی فارسییە، واتە: پەرژ و بڵاو. مەبەست لەو شیعرانەیە کە لەژێر ناونیشانێك و لە بابەتێکدا کۆناکرێنەوە. (ئامادەکار)

(٢) ئەم دوو شیعرەم لە سەید ئەحمەدی سەید محەمەد بیستووە.

**آسمان می گفت آن دم با زمین**

**گر قیامت را ندیدســـــتی ببین[1]**

واتە: لەو دەمەدا بومەلەرزە پەیدا بوو لە ترسا، بومەلەرزەی ئەو دەمە شتێکی زۆر گەورە و بەسامە، لەو دەمەدا واهیمە بە گیانی دەوت: ئەم باو ئاوە بای عاد و تۆفانی نوحن، ئاسمان لەو دەمەدا بە زەویی ئەوت: ئەگەر ڕۆژی قیامەتت نەبینیوە وەرە بیبینە.

هەر لە شیعری پەڕاگەندەیەتی ئەم ڕوباعیە عەرەبیەی کە لە بابەت تەئویلی ئایاتی موتەشابیهاتی قورئانەوە وتوویەتی:

**وقصاری قول من أو**

**ول أن ظنوا ظنونا**

**ویقولون علی الرحـ**

**مان ما لا یعلمونا[2]**

واتە: ئەوپەڕی قسەی ئەو کەسانەی کە تەئویلی ئایاتی موتەشابیهاتی قورئان دەکەن، ئەمەیە کە گومانێك دەبەن و هیچی تر، لە زبان خواوە شتی وا دەڵێن کە نایزانن.

دیسانەوە دەگێڕنەوە: کە دەفتەردارێك بووە لە بەغداد پیاوێکی زۆر باش بووە، لە وەزیفە دەردەکرێت و زۆر کەس بۆی دلگیر[3] دەبێت، جا بەم بۆنەیەوە موفتی ئەم شیعرە عەرەبیەی وتووە:

---

(١) ئەم شیعرانەم لە مەلا غالبی خانەقینی بیستووە و لە پشتی تەهزیبەکەی شێخ عەلی قەرەداغیش نوسراوە.

(٢) ئەم شیعرەم لە ڕەئووف ناجی کەرکوکی بیستووە.

(٣) دلگیران: دڵتەنگ بوون. (فەرهەنگی خاڵ/ ل٢٣٧).(ئامادەکار)

**سامع عزله عليهم اعترض**

**إلا الذين في قلوبهم مرض**[(١)]

واتە: هەر کەسێك دەرکردنی دەفتەرداری لە وەزیفە بیستبێت خراپەی لە کاربەدەستانی حکومەت گرتووە، مەگەر ئەو کەسانە نەبێت کە دڵیان پیس و دەروونیان نەخۆش بێت.

مەحوی ئەم شیعرەی بەم جۆرە تەزمین کردووە:

**ســـــامع عزله عليهم اعترض**

**دعاء نصبه على القوم افترض**

**ومـا ارتضى بعزله مع فضله**

**إلا الذين في قلوبهم مـــرض**[(٢)]

هەمدیسان دەگێڕنەوە: کە جارێکیان والی بەغداد سەعاتێکی زێڕ دەدات بە موفتی، ناحەزەکانی زۆریان پێ ناخۆش دەبێت، جا بەم بۆنەیەوە ئەم شیعرە عەرەبیە دەڵێت:

**من ساعة أعطيتُ قد زلزلوا**

**زلزلة الساعة شيء عظيم**[(٣)]

واتە: بەهۆی سەعاتێکەوە کە پێم بەخشرا ناحەزەکان کەوتونەتە زەلزەلەوە، بەڕاستی زەلزەلەی ئەو سەعاتە شتێکی گەورەیە.

هەر لە شیعری پەڕاگەندەیەتی ئەم شیعرە فارسیەی:

**شيرين پسران ز جور خسرو**

**بر تُنگ شكر نبات بستند**[(٤)]

---

(١) ئەم شیعرەم بە تەزمینەکەیەوە لە مەرحوم مەلا عارفی ئەمینی وەسمان بیستووە.

(٢) بڕوانە: دیوانی مەحوی. (ل٤٦٩).(ئامادەکار)

(٣) ئەم شیعرەم لە مەلا غالبی خانەقینی و گەلێك کەسی تر بیستووە.

(٤) ئەم شیعرە لە پشتی تەمزیبەکەی شێخ عەلی قەرەداغی نوسراوە.

واتە: لاوچاکەکان و کوڕەشیرینەکان لە ترسی زۆر و ستەمی خەسرەو گیایان بەستووەتە دەمیان، کە وەك تونگەی شەکر وایە. واتە: کوڕە جوانەکان لە ترسی گەورەکانیان هەموو پوشیان بەستووەتە دەمیان، کە ئەمەش کینایەیە لە بێ دەنگی و قسەنەکردن لە ترسا. چەند جوانە! کۆکردنەوەی (شیرین، خەسرەو، شەکر، نەبات) لە تاقە شیعرێکدا، ئاماژەکردن بۆ سەرگوزەشتەکەی خەسرەوی پەروێز، کە لەسەر شیرین و نەباتی ژنیا کاتێك کە چوو بۆ ئەسفەهان حەزی لە ژنە سۆزانیەك کرد ناوی (شەکر) بوو.[١]

هەر بەم ڕەنگە دەگێڕنەوە: موفتی جارێکیان ئیجازەی عیلمی دەدات بە قوتابیەکی، لەو کاتەدا کە ئیجازە نامەکەی ئەداتە دەست پێی دەڵێت:

**عمرت دراز باشد و علمت عطیه بخش**

**علم عطیه بخش زهر عمر خوشتراست[٢]**

واتە: عومرت درێژ و عیلمت بە بەهرە بێت بۆ خەڵکی، عیلمی بە بەهرە لە هەموو عومر و ژینێك خۆشترە.

هەروەها دەگێڕنەوە: کە جارێکیان چەند کەسێك لای موفتی دادەنیشن، یەکێکیان دەڵێت: ئەدەب خانە لە خانودا تا زۆر بێت کەمە. ئەوانی تریش دەڵێن: تەنها یەکێك بەسە، ئینجا موفتی بەم بۆنەیەوە ئەم شیعرە فارسیە دەڵێت:

**وقت حاجت جایگاهی چون خلا دلخواه نیست**

**هرکه انکارش کند از کون خود آگاه نیست[٣]**

واتە: لە کاتی سەرئاوا شوێنی وەك پێشاو[٤] خۆش و دڵگیرنیە، هەر کەسێك ئینکاری ئەمە بکات ئاگای لە قنگی خۆی نیە.

---

(١) بۆ زانیاری زیاتر لەسەر ئەم سەرگوزەشتەیە بڕوانە: نظامی گنجوی، خسرو و شیرین. (ل٤٨٥ و دواتر). (ئامادەکار).

(٢) ئەم شیعرەم لە مەلا غالبی خانەقینی بیستووە.

(٣) ئەم شیعرەم لە فتح الله ئەسعەد بیستووە.

(٤) پێشاو: بریتییە لە ئاودەستخانە. (فەرهەنگی خاڵ/ ل١٠٦).(ئامادەکار)

# نەسری[1]

موفتی هەروەك لە شیعردا بەشدار و دەست درێژ بووە، لە نەسریشدا هەروەها بووە. (سەید مەحمودی ئالوسی) لە کاتی نوسینی تەفسیری (روح المعانی)دا لە گەلێك لاوە کە گرێیەکی هاتبێتە پێش پرسیاری لە موفتی کردووە، ئەمیش بەسەر پەنجەی ژیریی و بیر گرێکانی بۆ کردووەتەوە و تەفسیری بۆ لێ کردووە و سەیدی ئالوسیش بەناوی موفتیەوە لە تەفسیرەکەیدا نوسیویەتی.[2]

موفتی نەسری ئێجگار زۆرە، بەڵام وا بۆ نموونە دوو پارچەی بەبێ تەرجەمە دەنوسین.

یەکەم: کاغەزێکی عەرەبییە کە لە بەغدادەوە نوسیویەتی بۆ ئەستەمبوڵ لە وەڵامی کاغەزێکی سەید مەحمودی ئالوسی دا، کە ئەمیش کاغەزەکەی لە کتێبی (غرائب الاغتراب)ی دا نوسیویەتەوە.

دووەم: تەقریزێکی کە کردویەتی لە قەصیدە ڕائیەکەی (عبدالباقی عومەریی) کە بە شیعریش تەقریزی کردبوو، لە پێشەوە نوسیمان.

پارچەی یەکەم سەید مەحمود لە کتێبی ناوبراویدا دەڵێت:

---

(١) نەسر (نَثْر): وشەیەکی عەرەبیە، واتە: پەخشان. کە بریتییە لەو نوسینەی بەشێوەی شیعر نەنوسرابێت و وەزن و کێشی نەبێت. (ئامادەکار)

(٢) یەکێك لەو جێگانەی کە سەید مەحمودی ئالوسی لە تەفسیرەکەیدا ناوی موفتی زەهاوی دەبات، لە تەفسیری سورەتی (المؤمنون) ئایەتی (١٨) لە (ب١٨/ل٣٠٣)دا دەڵێت: (وقد زاد بعض أجلة أهل العصر، العاصرين سُلاف التحقيق من كَرْم أذهانهم الكريمة أكرم عصر، أعني به ثالثَ الرافعي والنواوي، أخي الملا محمد أفندي الزهاوي، فقال:...).

واتە: (وە چەند خاڵێکی زیاتری باس کردووە کەسێك لە پیاوە گەورەکانی ئەم سەردەمە، کە پاڵفتەی شەرابی لێکۆڵینەوەی پاڵاوتووە لە ترێی بیری مەزنی خۆیەوە بە باشترین پاڵاوتنێك، مەبەستم لە سێیەمینی ئیمامی ڕافعیی و نەواویە، برام مەلا محەمەد ئەفەندی زەهاوییە، فەرمویەتی:...). (ئامادەکار)

(وكتب لي بعد أن كتبت له ما جارت به على سائر الضياع يد الغفلة، ثالث الرافعي والنواوي، رئيس مدرسي بغداد، محمد أفندي الزهاوي، ما نصه:

**الشوق أعظم أن يُحيطَ بحدِّهِ**

**قَلَمٌ وأن يَطوى عليه كتـاب**

إلى حضرة الشهاب الثاقب، الساطع نوره في المشارق والمغارب، ذي المقام المحمود، واللواء الذي هو بأيدي الفضائل معقود، علامة علماء الآفاق، ومن وقع على فضله وكماله الاتفاق، النسيب الذي لو انتسب لقيل في نسبه:

**نسب كأنَّ عليه من شمس الضحى**

**نوراً ومـــن فلق الصبـــاح عموداً**

والحسيب الذي لو احتسب لأُنْشِد عند حسبه:

**نفسُ عصامٍ سَوَّدَتْ عصـاماً**

**وعلمتــه الــكرّ والإقدامــا**

معدن الشرف والفتوة، ومصباح مشكاة آل بيت النبوة، مولاي الأفضل الأعلم، السيد السند الأفندي المفخم، لا زال في حضر وفي سفر، ذاك الشهاب يضيء كالقمر.

أما بعد، فقد ورد إلى المخلص الداعي من المقام المحمود ذلك الكتاب، الذي أعجز بفصاحته وبلاغته بلغاء الكتاب، فرد عليّ بوروده شرخ الشباب، فأخذته لوحشتي خير أنيس، ولوحدتي نعم جليس. وإني وحرمة العلم وذويه، وحق الفضل وبنيه، منذ امتطيتم غارب الغربة، وأورثتم في الفؤاد كربة وأي كربة، وركبتم راحلة الارتحال، قاصدين دار الخلافة العلية التي هي محط رحال الرجال، قد أصبحت لدي دار السلام جحيماً، وقاسيت من ألم الفراق عذاباً أليماً.

**يا سادتي كان الفـــرا**

**قُ مقدّراً فمتى اللـــقا**

**ما ذقتُ طعم العيش بعـ**

**دكـم ولا اخترت البقا**

**يــكفيكمُ أن النــعيـ**

**م لــبعدكم عندي شقا**

وكيف أعبر عن حالةٍ ضميرك مني أعرف بها. أسأل الله –تعالى شأنه وعظم سلطانه– أن يطوي بلطفه شقة البعاد والبين، وينشر علينا رحمته، ويعيدكم لطرفنا بصفاء الخاطر قرير العين، لنصرف ما نجده من العناء، بمطالعة طلعة الشهاب أبي الثناء، والدعاء).[1]

پارچەی دووەم لە تەقریزی قەسیدەکەی (عبدالباقی عومەریی)دا کە لە دیوانەکەیدا چاپکراوە، دەڵێت:

(الله أكبر، انظروا أدباء الأمصار، واعتبروا يا أولي الأبصار، هل قامت القيامة؟ أم كشفها لنا في الدنيا على وجه الكرامة شيخ الشعراء السري، حضرة عبدالباقي أفندي العمري، متعنا الله تعالى ببقائه، وأعاد علينا من بركات إنشاده وإنشائه؟ فإنه أطلع هذه القصيدة، فإذا الشمس كوّرت، وأبدع معانيها المصيدة، فإذا الوحوش حشرت، ونظم كلمها فإذا الكواكب انتثرت، ووقر البحر الخفيف بها فإذا البحار سجرت، تتلى رقيقة الألفاظ على قاسية القلوب الغلاظ، فإذا الجبال سيرت، يسمعها الأولياء والأعداء فإذا الجنة أزلفت، وإذا الجحيم سعرت، ثم خمّسها فجمع الشمس والقمر، وقرن –لله درّه– بين الدراري والدرر، وإن هذه لكرامة أوثر بها لا سحر يؤثر)[2].[3]

---

(١) بڕوانە: ئالوسی، غرائب الاغتراب. ل٢٥٢و٢٥٣. (ئامادەکار)

(٢) بڕوانە: (الترياق الفاروقي أو ديوان عبدالباقي العمري). ل١٧٩.(ئامادەکار)

(٣) موفتی زەهاوی بەو پێیەی کە زانایەکی ناودار بووە و پێگەیەکی گەورەی هەبووە لە بەغدادا،زۆر لە زانایانی سەردەمی خۆی کە کتێبێکیان داناوە داوایان لە موفتی زەهاوی کردووە پێشەکی بەباڵابڕین (تەقریز) یان بۆ بنوسێت.

لێرەدا سێ پێشەکی تری موفتی کە دەستمکەوتووە بڵاودەکەمەوە، کە مامۆستای خاڵ ئەم چەند پێشەکیەی نەنوسیون و ئاماژەی پێ نەداون. موفتی هەریەکێکیانی لە بۆ کتێبێك نوسیوە. بێگومان زەهاوی نوسینی لەم جۆرەی زۆرە و پەرت و بڵاوە، گەر کۆ بکرێتەوە شتێکی زۆر و بە بایەخی لێدەردەچێت.

یەکەمیان: پێشەکیەکە کە موفتی بۆ (شرح تهذيب المنطق)ی شێخ تاهای سنەیی –کە زانایەکی گەورەی کورد بووە و لە بەغداد ژیاوە– نوسیوە، ئەمەش دەقەکەیەتی:

(بسم الله الرحمن الرحيم. أحسن منطق وكلام، حمد مبدع برّأ الأنام، وصلاة مع سلام على مبلغ الأحكام، محمد المصطفى وآله وصحبه الكرام.

أما بعد، فهذا الممزوج بقسم المنطق من التهذيب، شرح ألّفه الفاضل الأديب، غرة ناصية الأيام، وعزة المولى الكرام، نجل العالم ابن العالم الرباني، طه أفندي ابن الشيخ أحمد أفندي ابن الشيخ محمد القسيم السنوي الكوراني. ولكونه نبذة من آثاره، ورشحة من أمطاره، ولمعة من أنواره، لا يفتقر في الإذعان بطيب ما يحويه من البيان، إلى إقامة البرهان. فإن المسك لا يفوح إلا مطيّبا للمشام، والصباح لا يلوح إلا مجليا للظلام.

وإني وإن كنت –ولله الحمد– ممن يستدل بالمؤثر على الأثر، ويغنيه العيان عن الخبر، سرحت سائم النظر أي سرح، في المراتع المريعة لهذا الشرح، كمن دأبه الاختبار، والاستدلال على المؤثر بالآثار، فرأيته بعدما تأملت أنه كما أملت.

فحمدت الله على فضله الجزيل، والله يقول الحق وهو يهدي السبيل.

الداعي لدوام الدولة العلية العثمانية، المتشرف بتربة الحرمين الشريفين، المفتي ببغداد المحمية: محمد فيضي. عفي عنه).

دووەمیان: پێشەکیەکی تری موفتیە بۆ (هدى الناظرين، شرح تهذيب الكلام)ی هەمان شێخ تاها سنەیی نوسیوە، ئەمەش دەقەکەیەتی:

(بسم الله الرحمن الرحيم. الحمد لله على شرح الصدور بالهدى، والتهذيب عما يفضي إلى الردى، والصلاة والسلام على من أظهر صدق حديثه بقديم الكلام، وآله وصحبه الكاسرين عظام متون الأكاسرة العظام.

وبعد، فلا أقسم بالعلم الشريف، وعزة مستجار التصنيف والتأليف، إن هذا الشرح الموسوم بـ(هدى الناظرين) قد طابق مسماه السُما، نَعَم نِعْمَ ما قيل: الألقاب تنـزل من السما، فإنه يهديهم إلى تهذيب الكلام، ويفيدهم تعريفه، فهو له بلا كلام كلام. بل كان المتن ناراً تحرق شبه العدى، فوجد هذا الشرح عليه ولا بدع أن يوجد على النار هدى. فمن شاهد حسنه بعد تصعيد النظر والتصويب، لا يرى بدّاً من التقريظ والتصويب.

وكيف لا! ومؤلفه العالم الفاضل الشيخ طه أفندي لم يأل جهداً في تحقيق مسائله، وتدقيق دلائله، وحلّ مشكلاته، وتفصيل مجملاته، وتحرير مقاصده، وتكثير فوائده. فهو حقيق بأن يعتنى به قراءةً وتقريةً، ولا يترك سدى، ولا أحسب عاقلاً يستحب العمى على الهدى.

